# دڵە نەخۆشەکان

# و

# چارەسەریان

**وەرگێڕانی: مسعود حەمەمراد مەجید**

**چاپی دووەم**

سلێمانی ....................2010

لەبلاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی رێنما
زنجیرە: (٢٥٧)

ناسنامەی کتێب


• دڵە نەخۆشەکان و چارەسەریان

• دانەر: شیخ الإسلام إبن تیمیه (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت)

• لێکۆڵینەوە و بڵاوکردنەوەی: د. محمد زینهم محمد عزب

• وەرگێڕانی بۆ فارسی: علی صارمی

• وەرگێڕانی بۆ کوردی: مسعود حەمەمراد مەجید

• نەخشەسازی بەرگ و ناوەوە : سەروان خورمالی

• پێداچوونەوەی: مامۆستا عەبدوڵلا

• تیراژ: ١٠٠٠

• نۆبەت و ساڵی چاپ: دووەم، ٢٠١٠

• ژمارەی سپاردن: ی وەزارەتی ڕۆشنبیری

• شوێنی چاپ: چاپخانەی کەنج


ناونیشان: سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.
ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)



# پێرست



پێشکەشە بە دایکی خۆشەویستم:

دایکێک کە هەموو هەوڵ و ماندووبوونی ئەوەیە تا منداڵەکانی بە ڕێک و پێکی پەروەردە بکات، و ئەوان بە شێوەیەکی باش ڕەوانەی کۆمەڵگە بکات، دایکێک کە هەموو تەمەنی بە ئارام گرتن و پەنا گرتن بە خوا، بۆ پاریزکاری کردنی پایەکانی خێزانی سەرف کردووە.

## پێشەکی وەرگێڕ:

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده و نستعينه و نستغفره و نعوذ بالله من شرور انفسنا و سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له و من يضل فلا هادي له و أشهد أن لا اله الا الله وحده لا شريك له و أشهد أن محمداً عبده و رسوله، أما بعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله و خير الهدى هدى محمد (ﷺ) و شر الامور محدثة و كل بدعة ضلالة و كل ضلالة في النار.

مرۆڤ هەر لەو ڕۆژەی کە پێی خستۆتە نێو پڕۆسەی بوونەوە بە دوای ناسینی خۆی بووە و ئەبێت و هەیە. چونکە خوا بەم پێویستیەی مرۆڤ دەزانیٚ هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە فیترەتێکی لەناودا دروست کرد تا بە هۆی ئەوەوە بگاتە ڕزگاری و نەجات. بەڵام ئەم فیترەتە پێویستی بە پەروەردە و فێرکردنی ڕاست هەیە، لەم ڕووەوە خوا ئەدیانی بۆ مرۆڤەکان بە دیاری نارد. سوڕی ژیان هەروا دەڕۆشت و ئەدیان و پێغەمبەرانی ئیلاهی یەك بە دوای یەکدا دەهاتن تا وای لێهات دەبوایە کۆتا پێغەمبەر بۆ گەیاندنی مەزنترین و تەواترین ئایین دەرکەوتبا. هەروەها

مرۆڤایەتی دەبوایە بەوپەڕی بەندایەتی تەواوەتی گەشتبا، و گەیشتن بەوپەڕ و تەواوی.

بەندایەتی و بەندەیی پێویستی بە دڵێکی پاك و بێ گەرد و ڕاستگۆدەبێت، کە دەبوو زەمینەیەك بۆ هاتنە خوارەوەی ئیمان لەودا هەبێت. بەڵام دڵی مرۆڤەکانی ئەو ڕۆژگارە بە هۆی بت پەرستی و ون کردنی ئەصڵی خۆیان، تووشی ستەم کردن و نەزانی و بێدینی هاتبوون و مرۆڤەکان تووشی خراپی و لەناوچوونی توند لە ڕوی ڕۆحی و ڕەوانی و ڕەوشتی بووبوون.

تا ئەو شوێنەی کە مرۆڤ، نەوەی خۆی بە زیندووی دەخستە چاڵ. فاحیشە و بێسەروبەری بە لوتکەی خراپی خۆی گەیشتبوو. بڵاوکردنەوەی فاحیشە، شانازی و داوێن پاکی بەو پەڕی پەستی دەژمێردرا. پیرۆزییەکان دژی پیرۆزی و دژی پیرۆزییەکان قاڵبی پیرۆزی پەیدا کردبوو. ستەمکاری، نەزانی، گومڕایی، پیسی، خراپی، ناپیاوی، درۆ، خیانەت، زیادەڕۆی ...هتد بە ناوی پیرۆزییەکانی ئەو کۆمەڵگەیە لەو ڕۆژگارەدا ڕەواجیان پەیدا کردبوو، بە کورتی دنیا بەرەو خراپی و داهاتووی ونبوو دەڕۆیشت. لە حاڵ و وەزعێکی ئاوادا پێویست بوو تا ئایینی ئاسمانی و پەرتووك نازڵ بێت، و ئەم گومڕاییانە لەناو ببات، و دەبوو ئەم پەرتووکە لەگەڵ پەرتووکە ئاسمانیەکانیتر بەهێزتر و پڕتر و گشتگیرتر بێت. لە ناکاو خوا هەر لەناو ئەم

هـۆزە نـەفام و بـێ بڕوایانـە کەسـێکی پایـە بـەرز و شایـستەی هەڵبـژارد، کەسـێك کـە دوایـی گـۆڕا بـە باشـترین و بـەڕێزترین دروستکراوی خـوا. کەسێك کـە لـە هـەموو ڕووەکانـەوە بە کـەماڵ گەیشت. کەسێك کە بۆ مرۆڤایەتی لـە دایك و باوك دڵسۆزترو لـە دایك بەرامبـەر بە نەوەکەی بە ڕحمـتر و لـە خـودی مـرۆڤ بۆ مـرۆڤ نـزیکتر بـوو. ئـەو کەسـە جگـە لـە موحەمـەد بـن عەبـدوڵلا (ﷺ) کەسـێکیتر نـەبوو، کـە بەپێغەمبـەری هەڵبـژێردرا و قورئـان بـۆ مرۆڤایەتی لەسەر ئەو هاتە خوارەوە.

بانگەواز دەستی پێکرد، ئیصلاح، تەزکیـە، تـەقوا، پـەروەردە، ئامۆژگاری، هیدایەت، نوور، پیاوەتی، ڕاستگۆی، پاکی، ئیحترام، چاکە و سەدان سیفاتی چاکیتر دوبارە مانایان پەیدا کردەوە. مرۆڤ لەوپـەڕی خراپـی و گومڕایی تـەواوەتی پێـی خـستە نێـو پڕۆسـەی ژیـانێکی تـازەوە. فیترەتـەکان بـە خەبـەر هاتنـەوە و دڵـەکان بـەرەو پاکبوونـەوە جووڵان، دڵـەکان لـە یـەکتر نزیـك بوونـەوە و تـەقوا کـە گەورەترین بـەری ئیمانـە لـە دڵەکانـدا ڕەگـی داکووتـا، و دیـسانەوە چـرای نـووری هیدایـەت بـەرپا بـوو. مـرۆڤ دیسانەوە بـەرەو ژیـانی ڕاسـتی خـۆی گەڕایـەوە و بـە ڕێـڕەوی ژیـان بەردەوامیـدا. بـەڵام شـەیتان بـەردەوام بـە وەسوەسـەکانی لـە کـەمینی مرۆڤدایـە و بـە شوێن گۆڕانی فیترەتـی مـرۆڤ و چاندنی تـۆی کوفر و بێ دینـی لـە دڵەکانـدا بـوو، ڕکابـەری بـەردەوامی مـرۆڤ لەگـەڵ شـەیتان دەسـتی

پێکـرد و ئـەم ڕکابـەری و موونافەسـەیە بـەردەوام دەبێـت. لـەو شوێنەوە کە شەیتان هەموو کات وەسوەسە دەخاتە دڵەکان و بە شوێن گومڕا کردن و گۆڕانی ئەوانە، دانەری بەڕێزی ئەم کتێبە بە شێوەی نووسین دەری هێناوە و لە ناویدا ئەو نەخۆشیانەی کە بەهۆی شەیتانەوە لە دڵی مرۆڤدا سەرهەڵدەدن و پەیدا دەبن دەست نیشانی کردوون و چارەسەریشی بۆ داناون. ئێمەیش بە نۆبەتی خۆی ئەومان بەزمانی فارسی وەرگێڕاوە و پێشکەشی خوێنەرانی بەڕێزی دەکەین. هیوا دارین کە ببێتە هۆی سوود بەخشین، لە کۆتایدا سوپاسی برای بەڕێزم عەبدوڵلای ریگی ئەحمەدی دەکەم کە ئەرکی پێدا چوونەوەی گرتە ئەستۆ.

# پێشەکی لێکۆڵەر:

الحمد لله و الصلاة و السلام على افضل خلق الله سيد العالمين سيدنا محمد (ﷺ) الصادق الامين صاحب السيرة العطرة الزكية و بعد:

ئێمە بە دوای خستنە ڕووی گۆشەیەك لە ژیانی زانایەك و گەورەیەك لە گەورەکانی ئیسلامداین کە لە کتێبەکانی ئەو لە بەشە جیاجیاکانی زانستی دینی لەوانە: تەفسیر، فەرموودە، فیقە، کتێبخانەیەکی گەورەی دروست کردووە.

ئەم زانایە کەسێك جگە لە شێخ الإسلام إبن تیمیه (احمد بن عبد الحليم بن عبد السلام) کەسیتر نیە کە لە کاتی دەسەڵاتی ظاهر هاتۆتە دنیاوە، لەو کاتەدا ظاهر دەسەڵاتی میصر و شامی لە دەستدا بوو. إبن تیمیە تەمەنی منداڵی لە ژێر دەسەڵاتی ظاهر بردە سەر و کاتێك کە ظاهر مرد إبن تیمیە نەوجەوان بوو، خێزانی إبن تیمیە لە ناوچەی حەران دەژیان. بە زانا بوون لە دینداری و کارامەیی لە بیرو باوەڕ و فیقە ناوبانگ و لێپرسراوی فیقهی ناوچەی حەڕانیان لە دەستدا بوو. باپیریشی هەر لە پێشەوایان و گەورەکانی ئەوکات دەژمێردرا. علامە شمس الدين ذهبی دەڵێت:

((شیخ الاسلام إبن تیمیه پێمی ووت: کە شێخ إبن مالك فەرمووی خوا فیقه و زانستی ئایینی بۆ مجدالدین إبن تیمیه (باپیری إبن تیمیه) بە شێوەیەك نرم کردووە وەك چۆن ئاسنی بۆ پێغەمبەر داود (علیه الصلاة و السلام) نرم کردبوو)). إبن تیمیه دەڵێت: باوە گەورەم مجدالدین کەمێ توونـد و عەسەبی مەزاج بوو. جارێك کۆمەڵێك لە زانایان لە بارەی بابەتێك پرسیاریان لێ کرد باوە گەورەم لە وەڵامدا ووتی: بۆ ئەم بابەتە شەست ڕێگا هەیە، پاشان بە ڕیز دەستی کرد بە خستنە ڕوویان تا ئەو کاتە ئەوان ماندو بوون و وتیان بەسە، و لە هەمان کاتدا لە هزر و بیری بێ هاوتا ئەو مات و بێ دەنگ بوو بوون. سەرەنجام ساڵی ٦٥٢ ھ ق ماڵئاوایی لە دنیا کرد.

لە بەناوبانگترین کتێبەکانی دەتوانین بڵێن کتێبی (منتقی الاخبار)ە کە لەم کتێبەدا فەرموودەی پەیوەست بە بوارە جیاوازەکانی فیقهی کۆ کردۆتەوە، و موحەمەد بن علی شەوکانی ڕاڤەیەکی لەسەر ئەو بە ناوی (نیل الاوطار) نووسیوە. نیل الاوطار کتێبێکی بە نرخە کە لە مەیدانی زانست و وانەوتنەوەدا جێگایەکی بەرزی هەیە. لەبەرئەوەی سیفەت گەلێکی زۆری لەخۆ گرتووە لەوانە کورت بڕی و زمانپاراو و ڕیزبەندی چاك لە پێشکەش کردنی لێکۆڵێنەوەکاندا و قووڵی و پانی و گەورەیی بیر و نەزەری نووسەر. باوکی إبن تیمیە، شێخ شەهاب الدین

عبـدالحليم بـن تيميـەش کەسـێکی زانـا و گێـڕەرەوەی فـەرموودە (محدث) لە زانایانی حنبلی بوو. ئەو لە ناوچەی حەڕانەوە ڕۆشـت بۆ دیمەشـق و بـە وانەوتنـەوە لـە زانکـۆی ئەمـەوی کـە لـەو کاتـەدا سـەنتەری زانایـان و وانەبێـژانی گـەورە بـوو خـەریك بـوو، زانکـۆی ئەمـەوی جێگایـەك نـەبوو کـە هـەر زانایـەك و مامۆسـتایەك بتـوانێ وانە بڵێتەوە. وانەکانی شێخ شەهاب الدين لـەم ڕووەوە نیسبەت بـە وانـەکانی ئـەوانیتر جیـاوازی هـەبوو، ئـەم بـەبێ خـۆ ئامـادەکردن و بکارهێنـانی کتێـب وانـەی دەوتـەوە و تـەنها پـشتی بـە هـزر و بیری خـۆی بەسـتبوو. هـەروەها سـەرۆکی دار الحـديث الـسکريە لـە قصاعين ی گرتە ئەستۆ و هەر لەو شوێنە دانیشت و سـەرەنجام لە ساڵی ٦٨٢ هـ ق کۆچی دوایی کرد.

إبن تیمیە لە خێزان و جەوێکی وادا بەهـەوڵ و ماندو بوونی زۆر دەستی بە خوێندن کرد، بەم شێوەیە کـە مێژوونوسـان و زانایـان و گەورەکانی سەردەمی خۆی لەبارەیەوە دەڵێن: ئـەم لەگـەڵ ئەوەشـدا تەمـەنێکی کـەمی هـەبوو وەکـو منداڵـەکانیتر کاتـەکانی بـە یـاری کردن و ڕابواردنەوە بەسەر نەدەبرد، بەڵکو زیاتر کاتـەکانی بە وانە خوێنـدن و فێرخـوازی دەبردەسـەر. ئـەو بـە باشـی کۆمەڵگـە و شارسـتانییەت و ئـاداب و عـادەتی خـەڵکی دەناسـی. لـە دانراوەکانیدا ئەمە بە ڕوونی دەردەکەوێت کـە ئـەو لـە قووڵی بیر و هزر و هۆشێکی باشی لـە ژیـانی تـاك و کۆمەڵگـەدا هـەبوو. هـەرگیز

ڕێگـای گۆشـەگیری و ونبـوونی لـە زانـست دا هەڵنەدەبـژراد بـەڵکو لەناو خەڵکیدا دەژیا. ئەو زانستی زەمانی خۆی یەك لە دوای یەك فێـر بوو تـا ئـەوەی کـە لـە زانـستی صـەرف و نـەحو و بەلاغـەت بـە کارامـەیی و شـارەزاییەکی تـەواو گەیـشت. و لـەم ڕوەوە بـە بـیر و هزرێکـی فـراوان و گرنگیەکە زۆری بە خوێنـدنی کتێبـی دەدا. و لـەپاڵ زانـستی دینـی بـە فێـر بـوونی کتێبـی بیرکـاری و وەرزشـی خەریك بوو. بە خوێندنی زانستی دینی و فیقە و اصول و واجبات و فـەرموودە و بێـرو بـاوەڕ و کۆمەڵناسـی و تەفـسیر زۆر گرنگـی دەدا، و فیقهـی حنبلـی ش لـە باوباپیرانییـەوە بـە مـیرات بـۆی مابوویـەوە. ابـن عبـدالهادی دەربـارەی ئـەو دەڵێـت: ژمـارەی ئـەو مامۆستا و زانایانەی کە ابن تیمیە لە خزمتیاندا بووە و دەرسـی خوێندووە دەگەیشتە دوو سەد زانا.

ئـەو چـەندین جـار مـسند امـام احمـد و کتێبـی شەشـانەی فـەرموودەی لـە لای مامۆسـتایانی جیـاواز خوێنـد. ابـن تیمیـە پەیوەندی زۆری بە تەفسیر هەبوو تا ئەو شوێنەی کە دەڵێن: زیاتر لە سەد کتێب لەسەر تەفسیری قورئانی پیرۆزی خوێندووەتەوە. دانراوەکـان و پەرتووکـەکانی ابـن تیمیـە کـە لـە سـنوری ١٣٠٠ پەرتووك تێپەڕیوەن، بە هۆی قوڵبوونەوەی زۆری لە بنەمای ئایین و پەیوەنـدی بێکۆتـای بـە تەفـسیری ئایـاتی قورئـان و شـێوازی زانـستی لـە خـستنە ڕووی بابـەت و توانـایی باشـی لـە زانـستی

ڕێزمان و ڕەوانبێژی و وتاردان و ئەدەب کە هەیان بوو لە غیرەتی تەواو، جێگای تایبەتیان هەبوو. یەکێ لە قوتابیانی بە ناوی سراج الدین لەبارەیەوە دەڵێت: ((کاتێک کە سواری ئەسپ دەبوو بەو پەڕی ئازایی و لێهاتوویەوە ڕیزەکانی دوژمنی دەبڕی و ڕاوەستاو و توند لەسەر ئەسپ دادەنیشت و بە هۆی هێرشە یەک لە دوای یەکەکانی بۆ سەر دوژمن ئەوانی دەشکاند، لە مەیدانی جیهاددا دەچویە ناو قوڵایی ڕیزەکانی دوژمن و لە مردن نەدەترسا)). سەرەنجام ئەم کێوە پڕ لە زانست و کردارە لە بیستی ذی قعدەی ساڵی ٧٢٨ هـ ق و دوای ئارام گرتنێکی زۆر لە ڕێگای بانگەواز و لە ڕێی‌خوادا لەوانە: چەندین جار زیندانی بوون _ وەفاتی کرد و ماڵئاوایی لە دنیا بە یەکجارەی کرد. ئەو لە گەورەکانی فیکر و بیری حنبلی بوو و خاوەنی مەدرەسەی تجدید و زیندوو کەرەوەی یەکتاپەرستی و ئازادیی لە بیر و باوەڕی ئیسلامی و دژی ئاداب و عادات و تەقالیدی نەفامی دەژمێردرا _ ئەم کتێبە لە بەردەستی تۆدایە یەکێ لە دانراوەکانی ئەوە کە بە خوێنەرانی بەڕێزی دەدرێت، بە هیوایی ئەوەی کە ببێتە جێگای ڕزامەندی حەق.

اسال الله والتوفيق فى خدمة العلم و الإسلام

د. محمد زينهم عزب

القاهيرة ١٤١٠ هـ ق _ ١٩٨٩ م

# دڵە نەخۆشەکان و چارەسەریان

إن الحمد لله نحمده و نستعينه و نستغفره و نعوذ بالله من شرور انفسنا و من سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له و من يضلل فلا هادي له، واشهد أن لا اله إلا الله وحده لا شريك له، واشهد أن موحةمةداً عبده و رسوله، صلى الله عليه و على اله و أصحابه و سلم تسليما.

خوا دەربارەی دووڕوو دەفەرموویت: ﴿**في قلوبهم مرض فزادهم الله مرضا**﴾ (البقره:١٠)

واتە: (لە دڵەکانیاندا نەخۆشی _ حەسوودی و کینە لەگەڵ باوەڕدارانددا _ هەیە و خوا نەخۆشیەکەیان زیاد دەکات).

﴿**ليجعل ما يلقى الشيطن فتنة للذين في قلوبهم مرض والقاسية قلوبهم**﴾ (الحج:٥٣)

واتە: (ئەم واسواسییە شەیتانیە _ و دروست کردنی کێشە لە ڕێ بانگەوازی ئاسمانی بە هۆی دژایەتکارانی بەرنامەی ئیلاهیەوە بەو شێوەیە کە خوا دەیەوێت ئەوان بە هۆی تاقیکردنەوەی

کەسانیتر دابنێ کە لە دڵەکانیاندا نەخۆشی دوو ڕووی چەکەرەی کردووە و هەروەها تاقیکردنەوەی کەسانێ بکات کە دڵەکانیان ڕەقە).

﴿لئن لم ينتة المنافقون والذين فى قلوبهم مرض والمرجفون فى المدينة لنغرينك بهم ثم لا يجاورونك فيها إلا قليلاً﴾ (الأحزاب: ٦٠) واتە: (ئەگەر دووڕووەکان و دڵ نەخۆشەکان و کەسانێك کە لە مەدینە تووشی پەرێشانی دەبن، لە ئیشی خۆیان دەست هەڵنەگرن ئەوا تۆ لە بەرامبەر ئەوانەوە هان دەدین و بە سەریشیاندا سەرت دەخەین ئەو کات جگە لە بڕێکی کەم لە ناو شاری مەدینەدا نامێننەوە _ بەڵکو لە بەرگی عیززەتی ئیسلام لەوێ دەردەکرێن).

﴿و لا يرتاب الذين اوتوا الكتاب والمومنون و ليقول الذين فى قلوبهم مرض والكافرون ماذا أراد الله بهذا مثلاً﴾ (المدثر: ٣١)

واتە: (ئەهلی کتێب و باوەڕداران _ لەبارەی ڕاستیەتی ئەم کتێبە ئاسمانیە _ ڕێگەی گومان نادەن بە خۆیان و کەسانێك کە لە دڵیاندا نەخۆشی دوو ڕووی هەیە و موشریکان بڵێن: خوا لە هێنانی نمونەیەکیوا چی ویستووە).

﴿قد جاتكم موعظة من ربكم وشفاء لما فى الصدور وهدى ورحمة للمومنين﴾ (یونس: ٥٧)

واتە: (ئەی خەڵکینە: لە لایەن خواوە بۆ ئێوەپەندێك _ بۆ ڕێنمای و ژیان _ و چارەسەرێك بۆ ئەو شتانەی کە لە

سینەکانتاندایە _ هەروەك کوفر، دوو ڕووی_کینە_ستەم و دوژمنی _ هاتۆتە خوارەوە و مایەی هیدایەت و ڕحمەتە بۆ باوەڕداران).

﴿وننزل من القران ما هو شفاء ورحمة للمومنين ولا يزيد الظالمين إلا خساراً﴾ (الإسراء:٨٢)

واتە: (ئێمە کۆمەڵە ئایەتێك لە قورئان دەنێرینە خوارەوە کە مایەی چاکبوونەوە و شیفای _ دڵەکان بێت لە نەخۆشی _ و ڕحمەت بێت بۆ باوەڕداران، بەڵام زەرەر و زیان و ئازاری ستەمکاران زیاد دەکات). ﴿ويشف صدور قوم مومنين و يذهب غيظ قلوبهم﴾ (التوبه: ١٥)

واتە: (و بە _ سەرکەوتن و ئازادی باوەڕداران بەسەر موشریکان سینەکانی ئەهلی ئیمان شیفا دەدەین و کینە لە دڵکانیان لا دەدا).

## نەخۆشی لاشە

نەخۆشی لاشە خاڵێکە لە بەرامبەر خۆشی و سەلامەتیدا، ناسایيە کە نەخۆشی توانایی سروشتی لاشە بێکەڵك بکات و لە ناوی ببات، وەکو: بێکەڵك بوونی توانای دەرمان کە بەم شێوەیە بە تەواوی لە ناو بچن وەکو _ کوێر بوون و لاڵ بوون _ یان بە تەواوی لە ناو نەچن بەڵام بە شێوەیەك بن کە سەرە و خوار لە

شتەکان بگەن و سەرە و خوار هەستی پێ بکەن. بۆ نمونە شرین بە تاڵ و تاڵ بە شیرین هەست پێ بکەن _ و یان ئەو شتانەی کە لە ژیانی دەرەوەدا وجوودیان نییە بە بیریاندا بێت کە وجوودی هەیە و لەم ڕووەوە بیر و هزری مرۆیی تووشی بێ سەر و بەری بێت.

نمونەکانیتر لە بێکەڵك بوونی جوڵانی ئاسایی لاشە و لاواز بوونی دەزگای هەرس و بیستن و بینین و ناپەسەندی لە خۆراکی باش و جێگەی پێویستی لاشە و خۆشەویستی ئەو شتانەی کە دەبنە زیان بۆ لاشە دەتوانرێت بوترێت کە ئەم جۆرە نەخۆشیانە دەبنە هۆی ئازارێکی زۆر بۆ لاشەی مرۆڤ. بەڵام لەگەڵ بوونی ئەم جۆرە نەخۆشیانە لاشە بە تەواوی نابوود نابێت بەڵکو بە هۆی تێکچوونی جوڵەی ئیرادەوە ئازارگەلێك بە هۆی فەسادی کەمی یان کیفی تووشی لاشە دەبێت، فەسادی کەمی لەوانەیە بە هۆی نەبوونی بێت کە بە هۆی خواردنی خۆراك چارەسەر بکرێت و یان بە هۆی زۆر خواردنەوە بێت کە بە پڕێم و کەم خواردنەوە چارەسەر بێت _ بەڵام فەسادی کیفی لەوانەیە بە هۆی هۆکاری دەرەکییەوە بێت وەکو سەرما یان گەرما _ کە بە وەرگرتنی تەوازون لە نێوانیاندا دەتوانرێت ئەوانە چارەسەر بکرێن. هەروەها ئەگەر دڵی مرۆڤیش نەخۆش بێت جۆرێك فەسادی لە هێزی فکر و ئیرادەی تاکدا پەیدا دەبێت. و ئەو کات نزیککەرەوەیەك دێتە پێشەوە بۆی کە ڕاستی نابینێت و ونی دەکات و یان بە سەرەو

**خوار لێ تێدەگات بە شێوەیەك کە ڕاستی و حەق بە پیس و خراپ وەردەگرێ و ناڕەوای خۆش دەوێت. لێرەدایە کە لای ئەو ڕاستی قالبی ناڕەوا و ناڕەوا قالبی ڕاستی دروست دەکات و پێشبینیەکانی لە بارەی هەموو ڕووداوەکان هەڵە و پێچەوانە دەبێت. هەر لەبەر ئەمەیە کە هەندێك لە (مرض القلب) بە دوودڵی و گومان تەفسیر دەکەن. هەروەك تەفسیری مجاهد[1] و قتادە[2] لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێن: ﴿فی قلوبهم مرض﴾ واتە: (لە دڵەکانیاندا نەخۆشی هەیە).**

**لە دڵەکانیاندا شك و دوو دڵی و گومان هەیە و هەندێك جار بە شەهوەتی زینا تەفسیریان کردووە. وەکو تەفسیری ئەم فەرموودەیەی خوا کە دەفەرموێت: ﴿فیطمع الذی فی قلبه مرض﴾** (الاحزاب: ٣٢) **کەواتە تەماعیان هەیە ئەوەی کە لە دڵیاندا نەخۆشی هەیە. واتە لە دڵیاندا خۆشەویستی زینا هەیە و هەر لەم ڕووەوە الخرائص کتێبی (اعتلال القلوب) لەبارەی نەخۆشی شەهوەتەوە نووسی، بە کورتی ئەوەی کە نەخۆشی بەردەوام دەکەوێتە بەر هەڕەشەی لەناوچوونەوە. گەرما و سەرما کەم دەیخاتە جێگا مرۆڤی نەخۆش لە سەلامەتی و توانایی کە مرۆڤەکان لە سەلامەتی**

---

[1] موجاهید کوڕی جبیر ئەبولحەجاج مەککی مەخزومی ٣٠ جار قورئانی لە خزمەت عەبدوڵلای کوڕی عەباس خوێندووە، ساڵی ٢١ ه ق لە دایکبووە و ساڵی ١٠٠ ه ق لە کاتی کڕنوشدا ماڵئاوای کرد.

[2] قەتادە کوڕی دعامە سوسی ئەبولختاب بەسری، ساڵی ٦٠ ه ق لە دایکبووە وساڵی ١١٧ ه ق ماڵئاوای کرد. موجاهید و قەتادە هەردوو لە خوێندکارانی هەڵکەوتووی عەبدوڵلای کوڕی عەباسن.

و توانـایی تـهواویان ههیـه ئـهم نییـهتی. چـاکی و سـهلامهتیش فاکتـهری خـۆی ههیـه کـه بـه هـۆی ئهوانـهوه دهست دهکـهویٚ یـان دژهکهی لـهناو دهچیٚت. هۆکاری نهخۆشـی جـۆری نهخۆشـیهکه بـه هیٚزتر دهکات، بهڵام به چارهسهر کردن نهخۆشیهکه لـهناو دهچیٚت. کهواتـه کاتیٚـك هۆکـاری نهخۆشـی پهیـدا بـوو ئـهوا مـرۆڤ نـهخۆش دهکـهویٚت و نهخۆشـیهکهی گـرانتر دهبیٚـت و هیٚـزی لاشـهی شـی دهبیٚتهوه و تـا ئـهو جیٚگایـهی کـه مرۆڤ لـهناو دهچیٚت، بهڵام ئهگـهر چارهسهر بکریٚت ورده ورده نهخۆشیهکهی لهناو دهچیٚت.

## نهخۆشی دڵ

ئهم جۆره نهخۆشیه له دڵ و دهروونی مرۆڤدا پهیدا دهبیٚت. وهك تورهیی وکینه توزی بهرامبهر به دوژمنیٚك که زاڵ بووه بهسهرتدا و ئـهم بابهتـه دهبیٚتـه هـۆی ئـیٚش و ئـازاری دڵ. خـوای گـهوره دهفـهرمویٚت: ﴿ويـشف صـدور قـوم مـومنين ويـذهب غـيظ قلـوبهم﴾ (التوبه:١٥) واته: (خوا سینهکانی _دڵی _ باوهرداران شیفا دهدات و تورهیی و رق و کینه له دڵهکانیاندا لادهبات).

کهواته شیفا هاتنی باوهرداران به له ناو چوونی ئیٚش و ئازار لـه دڵهکانیانـدا بـه دهسـت دیٚـت وهك دهڵـێن: تـورهیی و رق و کینـهی فلاٚن شیفای بۆ هات و یان له تۆڵهی بکوژ خیٚزانی کوژراو شیفایان بۆ هات و یان نمونهکانی وهکو ئهمانه، لیٚرهدا شیفا به واتای شیفا

هاتنی دڵ و دەروونی دڵی مرۆڤە لە غەم و پەژارە و تورەیی و ڕق و کینە و گرێ دەروونیەکان.

هەروەها دوودڵی و نەزانی بە نەخۆشی دڵ دەژمێردرێت. پێغەمبەر (ﷺ) دوفەرموێت: ((هلا سالوا اذ لم یعلموا؟ فان شفاء العی السوال)). واتە: ((ئەگەر نەیاندەزانی بۆچی پرسیاریان نەدەکرد؟ چونکە شیفای نەزانی پرسیار کردنە)). کەسێك کە سەبارەت بە شتێك گومان و دوو دڵی دەبات ئەوا دڵی هەست بە ئازار و نەخۆشی دەکات و بە گەیشتن بە زانین و دڵنیایی لەبارەی ئەو شتەوە دەگاتە ئارامی و دڵی سوکنایی دێت _ هەر لەبەر ئەمەیە کە زانایەك وەڵامی پرسیارێك دەداتەوە کە ڕاستی بە شێوەی ڕوون و ئاشکرا دەخاتە ڕوو و دەوترێت کە: قد شفانی بالجواب_ واتە بەم وەڵامە شیفام بۆ هات. یەعنی منی خستە ئارامی و ئاسایشێکی ڕۆحی و ڕەوانیەوە. کەواتە گومان و دوو دڵیەك کە لە دڵدا دروست دەبن پێویستی یەوەیە کە یەکسەر بە دوای وەڵامدانەوەی ئەودا خەریك بین تا ڕۆح و دەروونمان تووشی ئێش و ئازاری نەزانی نەبێت.

## نەخۆشی

دەبێ بزانرێت کە نەخۆشی ماوەیەکی کەمی هەیە لەگەڵ مردن. دڵ بە هۆی نەزانی دیارەوە بە تەوای دەمرێت و بە هۆی هەندێك لە

نەزانیـــەکان نـــەخۆش دەکـــەوێت. کەواتـــە دڵ ژیـــان و مردنـــە _ نەخۆشـــی و شـــیفایە _ کـــە گـــرنگتر لـــە مـــردن و ژیـــان و نەخۆشـــی شـــیفای لاشـــەیە. واتـــە ئەگـــەر دڵ تەندروســـت بێـــت هـــەموو لاشـــە تەندروســـتە و ئەگـــەر نـــەخۆش بکـــەوێت یـــان بمرێـــت ئـــەوا لاشـــەش نـــەخۆش دەکـــەوێت. لـــەم بـــارەوە بـــە فەرموودەیـــەك کـــە لـــە پێغەمبـــەر (ﷺ) ڕاوی بووە ئاماژە بکـەین کە فـەرمووی: ((الا وان فـی الجسد مـضغه اذا صـلحت صـلح الجسد كلـه واذا فـسدت فـسد الجـسد كله)).

واتە: ((ئاگاداربن کە لە لاشەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەیە کە ئەگەر ساغ و تەندروست بێت ئەوا هەموو لاشە تەندروست دەبێـت و ئەگـەر بـێ کـەڵك و نـەخۆش بـوو ئـەوا هـەموو لاشـەش بـێ کـەڵك دەبێت)). متفق علیه

هـەر لەبـەر ئەمەیـە هـەر کـات ژیـری و بەندایـەتی و ئامۆژگـاری و بانگەواز و دینداری چوونە ناو دڵەوە نەخۆشیەکەی کـەم دەبێتـەوە و بـــەرەو چـــاکبوونەوە و ســـەلامەتی دەڕوات. خـــوای گـــەورە دەفـەرموێت: ﴿لیجعل ما یلقی الشیطان فتنةً للذین فـی قلـوبهم مـرضٌ﴾ (الحج: ٥٣) واتە: (ئەم فیتنە شەیتانیانە بۆ ئەوەیە کە خوا دەیـەوێت ئەوانـە بخاتـە بـەر تاقیکردنـەوەی کەسـانێك کـە لـە دڵەکانیانـدا نەخۆشی هەیە). خوا شێوەکانی شەیتانی داناوە بۆ تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی دڵـە ڕەق و نەخۆشـەکان. چونکە ئەم جۆرە دڵانـە

یەکسەر شێوەکان و فیتنەکانی شەیتانی وەردەگرن و لەم تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنەدا دەکەون. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**لئن لم ینته المنافقون والذین فی قلوبهم مرض و المرجفون فی المدینه**﴾ (الأحزاب: ٦٠)

واتە: (ئەگەر دووڕووەکان و دڵ نەخۆشەکان و کەسانێك لە مەدینەدا تووشی سەرگەردانی دەبن کە لە ئیشی خۆیان دەست هەڵنەگرن). خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا باسی کەسە دڵ نەخۆشەکان دەکات و دەفەرموێت: کە ئەگەر نەچن بە شوێن چاککردن و ئیسلاح کردنی دڵیاندا ئەوا ئەوانە دەخەینە ژێر دەسەڵاتی باوەڕدارانەوە. ئەو نەخۆشیە کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە _ تێر کردنی شەهەوات و زیناکاری و...هتد. خوا دەفەرموێت: ﴿**ولیقول الذین فی قلوبهم مرض**﴾ (المدثر: ٣١) واتە: (بەو کەسانە دەوترێت کە لە دڵەکانیاندا نەخۆشی دووڕووی هەیە).

لەم ئایەتانەدا دڵی کەسانی دڵ نەخۆشەکان بە دڵی موشریکان و دووڕووەکان شوبهێنراوە و لەم حاڵەدا باس کراوە کە ئەوان خاوەنی دڵێکی پاك وەك دڵی باوەڕداران نین. بەڵکو لە دڵەکانیاندا نەخۆشی گوماناوی و شەهەواتی هەیە. خوا دەفەرموێت: ﴿**فیطمع الذی فی قلبه مرض**﴾ (الاحزاب: ٣٢) واتە: (کە دڵ نەخۆشەکان چاوی تەماع دەبڕنە ئێوە). ئەم نەخۆشیە نەخۆشی شەهوەت و ئارەزوویە

_ ئەگەر بە دڵێکی پاك و بێگەرد ئافرەتێك خۆی پیشان بدات ئەوا هیچ گوێی پێ نادات _ بەڵام دڵێك کە نەخۆشی شەهوەتی هەبێت بە هۆی لاوازی و سستیەك کە هەیەتی ناتوانێت لە بەرامبەر شتێکی ئاوادا خۆی بگرێت و بەرەو ئەو ئافرەتە مەیلی دەجوڵێت و بە پێی جۆر و تووندی نەخۆشیەکە کە وجوودی هەیە لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا و پەیوەندی دەگرێت و نزیك دەبێتەوە. واتە هەرچەندە نەخۆشی دڵ زیاتر بێت میزانی ڕوودانی ئەو لە تاوانی زینا زیاتر دەبێت. ئەگەر ئافرەتێك بە ئاواز و قسەی ناسك و هێواشی لەگەڵ ئەو کەسەدا گفتوگۆ بکات لەسەر دڵ و دەروونی ئەو خاڵێك و جێگایەك دروست دەکات.

## قورئان شیفای دڵانە

قورئان بۆ هەموو نەخۆشیەکان و ئەو شتانەی کە لە ناخی مرۆڤدایە لە شێوە و تاپۆکان و شەهەوات شیفایە. لە قورئاندا دلیل و بەیانێك هەیە کە ڕەوا و ناڕەوا لە یەکتر جیا دەکاتەوە. نەخۆشی و شێوە و تاپۆکانی فاسد کە لە زانست و بیر و هزردا تێکچوون دروست دەکەن لەناو دەبات _ بە شێوەیەك کە مرۆڤ شتەکان بەو شێوەیەی حەقیقەتی بوونیان لەسەریان دەسەلمێنێت دەبینێت و فەهمی ڕاستی و واقیعی لە چێوەی پەراوێزەکانی دەوروبەری خۆی دەبێت. لە قورئاندا جورەها حیکمەت و

ئامۆژگــاری بــاش لــە بــواری هانــدان و خــۆ ئامــادەکردن و داستانگەلێکی بەرچاو لە پەند و عیبرەت کە ببێتە مایەی ئیسلاح و ڕاست بوونـەوەی دڵـن بوونیـان هەیـە. لـە ئەنجامـدا دڵ بـە هـۆی ئەوانەوە بەرەو ئەو شتانەی کە بۆی سوود بەخشن نزیك دەبێتەوە و لـەو شـتانەی کـە زیانیـان هەیـە دوور دەکەوێتـەوە و هـەروەها لایەنگری حەق و ڕاستی و ڕێنمایی و ئامۆژکاری دەبێت.

قورئان لەناوبەری نەخۆشیەکە کە ببێتە هۆی بڕیارگەلێکی فاسد و نییـەتێکی خـراپ و بـە توونـدی لەگـەڵ ئـەم نەخۆشـیەدا دژایـەتی دەکـات تـا ئـەو کاتـەی دڵ چـاك دەکـات و نییـەت و ئیرادەی دڵـیش چاك دەبیت. و دڵ دووبارە بگەڕێنێتـەوە سـەر ئـەو فیترەتـەی کـە لـە سـەری دروسـت کـراوە، واتـە فیترەتێـك کـە ڕوو بکاتـە پەرەسـتن و بەندایـەتی. هـەر بـەو شـێوەیە کـە لاشـە دوای چارەسـەر کـردن دەگەڕێتـەوە سـەر حاڵـەتی ئاسـایی و سـەلامەتی خـۆی و هـەر بـەو شـێوەیە کـە لاشـە لـەو خۆراکانـەی کـە دەبنـە هـۆی گەشـە سـوود وەردەگـرێ _ دڵـیش لـە ئیمـان و قورئـان کـە دەبنـە هـۆی پـاکی و گەشـەی بـەهێز دەبێـت _ خـوای گـەورە لـەم بارەیـەوە دەفـەرموێت:

﴿قل هو للذين آمنوا هدى وشفاء والـذين لايومنـون فـى اذانهـم وقـر وهـو عليهمعمـى﴾ واتـە: (بڵـێ قورئـان بـۆ بـاوەڕداران مایـەی ڕێنمـایی و چـاکبوونەوەیە _ ئـەوان لـە ڕێگـای گـومڕایی و سـەر لێشێواوی دوور دەخاتـەوە _ و لـەو نەخۆشـیانە تووشـی گومـان و دوو دڵـی

**دەبن نەجات دەدات و دەبێتە هۆی کەڕی گوێکان و کوێری چاوانی بێباوەڕان)**.

# زەکات

زەکات لە ڕووی زمانەوانیەوە بە مانای گەشە و گەورە بوون دێت، هەروەها بە مانای زۆر بوون لە چاکە و ڕاستی و پاکی دێت. لە زمانی عەرەبیدا دەڵێن: (زکا الشیء) واتە ئەو شتەی زۆر بوو و گەشە و گەورە بوو و یان ئەو شتەی پاك بووەوە. هەرواکە لاشەی مرۆ پێویستی بە خۆراك لە خواردنی پاك هەیە و بە هۆی ئەوانەوە گەشە دەکات" دڵیش پێویستی بە پەروەردە و فێرکردنی ڕاست و دروستە تا گەشە بکات و چاکە وپاکی زۆر بێت و بە شێوەی تەواوەتی پاك و بێگەرد بێت. هەر بەو شێوەیە کە دبێ ئاگاداری لاشەی خۆمان بین کە لە زەرەر و زیان و ئەو شتانەی کە دەبنە کۆسپی گەشەی ئەو بەرگری بکەین، لە بارەی دڵیشەوە ئاگادار بین کە ئەو بە خۆراکی چاك و تەندروست تێر بکەین کە قورئان و سونەت دەتوانن خۆراکێکی چاك بن بۆ دڵ و پێشگیری لەو شتانە بکەن کە دەبنە هۆی نەخۆشی و بێ توانایی دڵ و بەربەستێك دەبن بۆ گەشەی دڵ. وەك چۆن لە گەشە و زیادبوونی کشتوکاڵ و ئاژەڵدا ئەم یاسایە حاکمە _ واتە دەبێت خزمەتی باش لە ئاو و پەیین (کووت) بکرێت تا کشتوکاڵ گەشە و گەورە بێت و زیاد بکات. ئەگەر ئەم بابەتە لەبەر چاو نەگرین ئەوا ڕووەك و ئاژەڵ و کشتوکاڵمان تووشی ووشکبوون و لە ناوچوون دەبن.

## خێر و خێرات (صدقە)

بەو شێوەیە کە ئاو ئاگر دەخنکێنێ و دەکوژێنێتەوە خێریش تاوان و گوناهی مرۆڤ لەناو دەبات و دڵ بە هۆی خێر کردنەوە پاك و بێ گەرد دەبێت. هەروەها خوا دەفەرموێت: ﴿**خذ من اموالهم صدقة تطهرهم وتزكيهم بها**﴾ (التوبە: ١٠٣) واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لە موڵك و سامانی ئەوان زەكات وەربگرە و ئەوان بە هۆی ئەوەوە پاك و سەلامەت بكە). هەروەها تەرك كردن و وازهێنان لە تاوان و خراپەكاری دەبێتە هۆی پاكبوونەوەی دڵ. تاوان و خراپە بۆ دڵ وەكو چڵكی لاشەیە بو مرۆڤ و گیای بژارن بۆ كشتوكاڵ. نەجاتدانی لاشە لە ئەخلاقی فاسد وەكو دەرهێنانی خوێنی زیادە و پیسە بۆ لاشە. هەروا كە لاشەی مرۆڤ بە لە دەستدانی خوێنی زیادە و تێكەڵ شادمان و حاڵی باش دەبێت و بە ئارامی و توانایی ئاسایی بۆ دەگەڕێتەوە و گەشە و گەورە دەبێت. دڵیش بەو شێوەیە هەر كات لە تاوان و ئەخلاقی فاسد دەست هەڵگری و تەوبە دەكات و كار و كردەوەی چاك و باش لە كردەوەی پیس و خراپ جیا دەكاتەوە، وردە وردە بە نیەتی پاك و ئیرادەی تەواو دەگات و دەبێتە هۆی بە هێزتر بوون و بە تواناتر لە ئەنجامدانی كردەوەی چاكە و بە ئارامی و ئاسایشی تەواو دەگات. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**ولو لا فضل الله عليكم ورحمة ما زكا منكم من احدا أبداً**﴾ (النور: ٢١) واتە: (ئەگەر گەورەیی و ڕحمەتی ئیلاهیی

نەبوایە بۆ حاڵی ئێوە ئەوا هەرگیز کەسێك لە ئێوە _ لە گوناه و تاوان _ پاك نەدبووەوە).

﴿وان قيل لكم ارجعوا فارجعوا هو أزكى لكم﴾ (النور: ٢٨) واتە: (ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە _ ڕێگەی چوونە ژوورەوە بە ماڵ نەدرا _ کەواتە بگەڕێنەوە چونکە ئەم گەڕانەوەیە بۆ ئێوە چاکتر و پاکترە).

﴿قل للمومنين يغضوا من ابصارهم و يحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم إن الله خبير بما يصنعون﴾ (النور: ٣٠) واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ: بە پیاوانی باوەڕدار چاوانی خۆیان بپارێزن و عەورەتی خۆیان _ بپۆشن و دوور بکەونەوە لە هاوسەرگیری ناشەرعی _ ئەمە بۆیان جوانتر و بەڕێزترە بێ گومان خوا بە ئاگاترە لەو شتەی کە ئەنجامی دەدەن و سزا و پاداشتی کردەوەکانیان دەدات). ﴿قد افلح من تزكى* وذكراسم ربه فصلى﴾ (الاعلى: ١٥) واتە: (بە ڕاستی کەسێك کە خۆی بە پاکی ڕابگری و ناوی پەروەردگاری خۆی بێنێ و نوێژ بکات و مل کەچ بێت لە بەرامبەر فەرمانەکانی خوای گەورەوە ئەوا سەرکەوتو و رزگار دەبێت). ﴿قد افلح من زكاها * وقد خاب من دساها﴾ (الشمس: ١٠) واتە: (بە ڕاستی کەسێك ڕزگار و سەربەرز دەبێت _ کە نەفسی خۆی بە پاك و خاوێنی ڕابگرێ _ و کەسێك نائومێد و سەرگەردان دەبێت کە _ نەفسی خۆی لە ناو شیرك و تاوان _ حەشار بدات و دابپۆشێت).

﴿**وما يدريك لعله يزكى**﴾ (عبس: ٣) واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ)! تۆ چی دەزانی _ لەوانەیە ئەو _ لە پەروەردە كردن و فێركردنی سوود وەربگرێ و خۆی پاك بكاتەوە).

﴿**فقل هل لك أن تزكى * وأهديك إلى ربك فتخشى**﴾ (النازعات: ١٩) واتە: (بڵێ ئایا مەیلت هەیە لەوەی كە تیایدای سەربەست و پاك ببنەوە و تۆ بەرەو پەروەردگارت ڕێنمایی بكەم تا تۆ ایەی ڕۆشنبیر و بێگەرد بیت).

تەزكیە لە بنەڕتدا بە مانای گەشە و گەورە بوون و وەرگرتنی بەرەكەت و زۆر بوونی خێر و خێراتە. بەڵام بۆ لەناو چوونی شەڕ و خراپەش بكار دێت. كەواتە هەر دوو جۆر لە ماناكان لە خۆ دەگرێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**و ويل للمشركين * الذين لا يؤتون الزكاة**﴾ (الفصلت: ٧) واتە: (وەیل بۆ بێباوەڕان _ كەسانێك كە خۆیان بە پاككردنەوە خۆیان خەریك ناكەن). لێرەدا مەبەست لە زەكات هەر ئەو تەوحیدەیە لە یەكتا پەرستی و باوەڕ بوون بە خوای تاك و تەنهایە، كە بە هۆی ئەوەوە دڵ پاك دەبێتەوە. لەبەر ئەوە ئەم یەكتا پەرستیە گەرەنتی لەگەڵدایە ئەویش لە ئەستۆ گرتنی نەفی هەر جۆرە خوایەكی درۆینە كە لە غەیری خوای تاك و تەنها بێت. هەر لەم حاڵەدا پەرستنی خوای تاك لە دڵدا جێگیر دەكات. ئەمە هەر ئەو ڕاستیەی (لا اله الا الله)یە كە بە هۆی ئەوەوە دڵەكان بە پاكی و نیەتی ئیخلاص دەگەن.

# تەزکیە

تەزکیە بە مانای پاککردنەوە دێت، لەوانەیە لە ئاستی ڕووکەش و دەرەوە یان لە ذات و جەوهەریدا شتێك بووە و پەیوەندی بە بیرو باوەڕ و هەستی ناوەوە بێت. وەك چۆن عەرەب دەڵێن: (عدلته) واتە لە ناو ئەودا دادپەروەری هەیە یان دادپەروەریم لە بیرو باوەڕی خەڵکیدا چەسپاندووە. خوا دەفەرموێت: ﴿**فلا تزكوا أنفسكم**﴾ (النجم: ٣٢) واتە: (لە پاك بوونی خۆتان قسان مەکەن و مەغرور مەبن). دەبێ بزانرێت کە ئەم بابەتە بەم وتەیەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿**قد افلح من زكاها**﴾ واتە: (بە ڕاستی کەسێك ڕزگار و سەربڵند دەبێت کە نەفسی خۆی _ بە ئەنجامدانی تاعەت و بەندایەتی و تەرك کردنی تاوان و خراپە _ پاکیزە بکات و دووری بکات). هیچ جۆرە دژایەتیەك نیە و هەر لەبەر ئەمەیە خوا دەفەرموێت: ﴿**هو اعلم بمن اتقى**﴾ (النجم: ٣٢) واتە: (ئەو لە کەسێك کە لە خوا دەترسێ بە ئاگاترە). هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**انا اعلم بما اخفيتهم وما اعلنتهم**﴾ (الممتحنه: ١) واتە:

(من زاناترم لە خۆتان لەو شتەی کە دەیشارنەوە و یان ئاشکرای دەکەن).

لەم ئایەتە پیرۆزانەی سەرەوە بەم جۆرە دەردەکەوێت کە خوا لەوەی مرۆڤ لەسەر غروری _ خۆی بە پاك و بە تەقوا بزانێت نەهی کردووە _ بەڵام لەوەی کە مرۆڤ بە دوای پاك کردن و دروست کردنی تەقوا لە خۆیدا بێت نەهی نەکردووە. هەروەك دەفەرموێت: ﴿الم تر إلى الذين يزكون أنفسهم بل الله يزكي من يشاء﴾ (النساء: ٤٩) واتە: (بە لاف و گەزاف خۆیان بە موتتقی لە قەڵەم دەدەن _ بەڵکو ئەوە تەنها خوایە کەسانێك کە خۆی دەیەوێت پاك دەکاتەوە).

یەعنی خوا هەر کەسی مەبەست بێت پاکی دەکاتەوە و لە پاکبوونیشی خەبەر دەدات. چۆن کەسێك لە بەردەم دادوەردا بێت و بەرپرسی جێگیر کردنی دادپەروەریە لەسەر شاهید و وجوودی دادپەروەری لەسەر شاهید جێگیر دەکات، پاشان بە ڕاستگۆ بوونی شاهید ڕای خۆی دەردەبڕێت. کەواتە لە ئەنجامدا یەکێ لە وسوەسەکانی شەیتان ئەوەیە کە ئینسان خۆی بە پاك و موتتقی بزانێت. لێرەدا دەبێ ئاماژە بەم بابەتە بکرێت کە لەبارەی تەزکیە و پەروەردەی نەفس کتێبێکی زۆر نوسراوە بەڵام بە داخەوە لە زۆربەی ئەم کتێبانەدا پشت بە فەرموودەی لاواز (ضعیف) تەنانەت هەندێ جار بە ناو بەستراوە. ئێمە بە دوای ناساندنی ئەم کتێبانەدا نین بە هۆی ئەوە کە ئەوەندە زۆرن کە قابیلی ژماردن

نین. بەڵام تەنها بەم مەسەلە ئاماژە دەکەین کە مرۆڤ دەبێ لە هەر زەمینەیەك کە پەیوەندی بە بازنەی ئیسلامەوە بێت مل کەچ بێت وەك پەیڕەوی کردن لە زانایان لە بیر نەکات و لە بازاڕی پڕ لە فیتنەی ئەمڕۆ بە دوای سەرۆك و زمان لوسەکان نەکەوێت و هەڵنەخەڵتێت. بۆ لێکۆڵینەوە و باسی تەزکیە بگەڕێتەوە بۆ ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن و جێگای متمانەن و لەواندا ئاماژە بە فەرموودەی صحیح و حسن دراوە.

## دادپەروەری

دادپەروەری هەر ئەو عدالتە میانڕەوەیە. دادپەروەری لە کرداری چاکبونی دڵە، هەروەك چۆن ستەم فاسد کردنی دڵە و لە تەواوی ئەو تاوانانەی کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات بەرامبەر بە نەفسی ستەم دەکات. ستەم لە خاڵێکدا لە بەرابەری دادپەروەریدایە. کەواتە تاك تا کاتێ دادپەروەر نەبێت ناتوانێ ستەم لەسەر نەفسی لاببات. چونکە چاکبونی لەسەر دادپەروەری قایمە و فەسادی لەسەر ستەم و بێدادپەروەری، کەاوتە هەر کاتێك کە مرۆڤ سەبارەت بە نەفسی ستەم بکات دەبێتە ستەمکار و نەفسی دەبێتە ستەم لێکراو. و هەر کات بەرامبەر بە خۆی بە دادپەروەری ڕفتار بکات ئەوا دادپەروەرە و نەفسی لە ژێر دادپەروەریدایە و ئەم پەیوەندیەی مرۆڤ لەگەڵ نەفسی خۆیدا بەرامبەر بە خەڵکانیتریش دروست دەبێت. کرداری چاکە لە دادپەروەری خۆیی (ذاتی) سەرچاوە دەگرێت و هەموو بەروبوومی کردەوەی مرۆڤ چ خێر و چ شەڕ بۆ خۆی دەگەڕێتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**لها ما كسبت وعليها ماكتسبت**﴾ (البقرە: ٢٨٦) واتە: (مرۆڤ هەر کارێکی چاکە

ئەنجام بدات ئەوا بۆ خۆی ئەنجامی داوە، و هەر کارێکی خراپە بکات ئەوا بە زیانی خۆی کردوویەتی).

لەم بارەیەوە بۆ زیاتر باسکردنی بابەتی باسکراو دەتوانرێ بەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بکرێت: ﴿**یاأیها الذین آمنوا قوامین لله شهداء بالقسط ولا یجرمنکم شنئان قوم علی الا تعدلوا اعدلوا هو اقرب للتقوی**﴾ (المائدة:٨) واتە: (ئەی کەسانێك کە ئیمانتان هێناوە بۆ جێبەجێ کردنی واجباتی خوا ئاگاداربن و لە بەرامبەر دادپەروەریدا شاهیدی بدەن و دژایەتیتان لەگەڵ قەومێکدا نەبێتە هۆی ئەوەی لەگەڵ ئەواندا دادگەری و دادپەروەری نەکەن، دادپەروەری ئەنجام بدەن کە زیاتر بە پارێزکار نزیکترە).

# کردار

کردار پێش ئەوەی کە کاریگەری دەرەوەی هەبێت لە ناو دڵ و دەروونـدا کاریگـەری دەبێـت. چـاکبوونی کـردار ڕەچـاو کردنـی دادپەروەریـە لـە ئاسـتی دڵـدا، و فاسـد بـوونی کـردار سـتەمە لـە ئاستی دڵدا. خوا دەفەرموێت: ﴿من صالحاً لنفسه ومن أساء فعليها﴾ (الفصلت: ٤٦) واتـە: (هـەر کـەس کـردەوەی چـاك بکـات ئـەوا بـە سوودی خۆیەتی و هەر کەس کرداری خراپە ئەنجام بدات ئەوا بە زیانی خۆی کردوویەتی). و لە بەرامبەر ئەوەدا دەفەرموێت: ﴿إن أحسنتم لأنفسكم وإن أسـأتم فلها﴾ (الإسراء: ٧) واتـە: (ئەگەر چاکە بکەن ئـەوا چاکەتان لەگـەڵ خۆتـان کـردووە و ئەگـەر خراپـە بکـەن ئەوا خراپەتان لەگەڵ خۆتاندا ئەنجامداوە).

کۆمـەڵێك لـە پێـشینە چـاکەکان (صـلف صـالح) وتوویانـە: لـە ئـەنجامی چـاکەکاریدا نوورێـك لـە دڵـدا و هێزێـك لـە لاشـەدا و ڕووناکیـەك لـە دەم و چـاودا و گـەورەیی و بـەڕێزی لـە ڕۆژگـاردا و خۆشەویـستی خـوا لـە دڵـدا پەیـدا دەبێـت. خـوا دەفـەرموێت: ﴿کلُّ امرِیٍ بما کسبت رهین﴾ (الطور: ٢١) واتە: (هەر کەسێك لە گروپـی ئـەو

کردارانەیە کە ئەنجامی داون). ﴿كلُّ نفس بما كسبت رهينة﴾ (المدثر: ٣٨) واتە: (هەر نەفسێك لە گروپی ئەو کردارانەیە کە ئەمجامی داون). ﴿وذكر به أن تبسل نفس بما كسبت ليس لها من دون الله ولي ولا شفيع وإن تعدل كل عدلٍ لا يؤخذ منها أولئك الذين أبسلوا بما كسبوا﴾ (الأنعام: ٧٠) واتە: (و بەوان پەند و عیبرەت بدە هەر کەسێ لە گروپی کردەوەیەکە کە ئەنجامی داوە و بەرپرسی ئەو شتانەیە کە بەدەستی هێناوە و جگە لە خوا بۆ ئەوان هیچ یار و هاودەم و میانجی و واسیتەیەك نیە و ئەگەر کەسێکی وا هەر جۆرە بەخشینێك بدات و لە تاوان بگەڕێتەوە ئەوا لیێ وەرناگیرێت و قەبووڵ ناکرێت، لەبەر ئەوەی ئەوانە لە گروپی ئەو کردەوانەن کە ئەنجامیان داون).

هەروەکو چۆن جەستەی مرۆڤ ئەگەر لە نەخۆشی نەجاتی بێت و بگاتە تەندروستی ئەوا دەوترێت کە مزاج و سروشتی هاتۆتەوە سەر خۆی، لەبەرئەوەی کە نەخۆشی لەناوچوونی مزاج و سروشتی مرۆڤە کە بە وجوودی ئەو جەستەی مرۆڤ هیچ کات بە ساغ و سەلامەتی هەمیشەیی ناگات _ چونکە لە دنیادا هەموو شتێك ڕێژەییە _ دڵیش هەروایە. ساغ و سەلامەتی دڵ لە دادپەروەریدا خەوتووە و نەخۆشی و دەردی دڵ لە ڕێی چەوت و ستەم و لەناوچووندایە، دەبێ کە دادپەروەری پاك و تەنها لە ڕووی زانستی و پراکتیکیەوە لە هیچ شتێك لە دنیای مادیدا نیە.

بەڵام بە ڕێژەیەك دەتوانرێت دادپەروەری تەواو ڕەچاو بکرێت و لە هەمان کاتیشدا دەتوانرێت بە ڕێژەیەکی کەم دڵ بگاتە ساغ و سەلامەتیەکی تەواو و تەندروست. هەر لەبەر ئەمەیە کە دەوترێت: ئەمە باشترە واتە سەبارەت بەو شتانەی کە لە دەور و پشتیدا هەن باشترە و یان دەوترێت کە ڕێگای سەلەف (پێشین) چاکترین و باشترین ڕێگایە. خوا دەفەرموێت: ﴿**ولن تستطيعوا أن تعدلوا بين النساء ولو حرصتم**﴾ (النساء:١٢٩) واتە: (ئێوە ناتوانن _ لە ڕووی ئەوینی دڵەوە _ لە نێوان ژناندا دادپەروەری و دادگەری بە تەواوی دروست بکەن هەرچەندەش هەموو هەوڵ و ماندو بوونی خۆتان بخەنە گەڕ). ﴿**وأوفوا الكيل و الميزان بالقسط لا نكلف نفساً إلا وسعها**﴾ (الأنعام: ١٥٢) واتە: (و پێوانە و تەرازوو بە تەواوی و کامڵ و دادگەرانە ڕچاو بکەن و ئێمە هیچ بە ئەنجامدانی شتێك بە فەرمانبەر دانانێن جگە بە قەد تاقەت و توانایی خۆی نەبێت). خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە و کتێبە ئاسمانیەکانی دابەزاندوە بۆ ئەوەی کە خەڵکی دادپەروەری و دادگەر و بە ویژدان بن و ڕفتار و کرداری پێ بکەن، دەبێ بزانرێت کە گەورەترین داد و دادپەروەری بەندایەتی خوای پەروەردگارە و هاوەڵ پەیدا نەکردنیەتی بۆی، کە بەندایەتی ڕاست و گەیشتن بە کەماڵی مەعنەوی هەر ئەمەیە. کەواتە بەندایەتی کردنی خوا ڕەچاو کردنی دادپەروەری لە مافی خەڵکی و پاشان ڕەچاو کردنی دادپەروەریە

لەسەر نەفس، کە لە سەری تەئکید کراوەتەوە. لە نێوان هەموو ئەم بوارانەدا چاکبوونی دڵ بە دەست دێت. کەواتە چاکبونی دڵ پێویستی بە گۆڕەپانێکی گەورەیە لە ڕفتار و کردار بۆ زۆرانبازی لەگەڵ گوناهاندا، هەروەها لێرەشدا نابێت دادپەروەری و میانەڕەوی لە بیر بکرێت.

## ستەم

ستەم سێ جۆرە کە هەر سێ جۆرەکەی لە جۆرەکانی نەخۆشی دڵ دەژمێردرێت، و لە بەرامبەر ئەوانەوە دادپەروەری هەیە کە سەلامەتی و تەندروستی دڵی لەخۆ گرتووە. ئیمام ئەحمەد بن حەنبل (ڕحمەتی خوای لەسەر بێت) بە هەندێك لە خەڵکی دەوت: ((ئەگەر دڵت بە پاکی و سەلامەتی بپارێزی ئەوا لە هیچ کەس ناترسی)). مەبەستی ئەوە بووە کە خۆفی مرۆڤ لە دروستکەری بە هۆی کۆمەڵێك نەخۆشیەوە وەك شیرك و بت پەرستی و تاوانەوە، و هەرکات لە دڵی مرۆڤدا باوەڕ وجوودی هەبێت ئەوا لە کەس ناترسێت. خاڵی گرنگی ئەم باسە لەم ئایەتە پیرۆزەدایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**الذین قال لهم الناس ان الناس جمعوا لکم فاخشوهم فزادهم ایمانا وقالوا حسبنا الله ونعم الوکیل**﴾ (ال عمران: ١٧٣) واتە: (ئەو کەسانەی کە خەڵکی پێیان وتن: خەڵکی بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئێوەدا دەستیان ناوەتە ناو دەستی یەکتر و دژ بە ئێوە لە دەوری یەك کۆبوونەتەوە، کەواتە لەمانە بترسە. ئەم هەڕشانە باوەڕی زیاتر بەهێز کردن و وتیان: خوا بۆ ئێمە بەسە و باشترین پارێزەر و کاربەجێیە).

# چاکبونی دڵ

چاکبونی دڵ بە مانای ژیان و درەوشانەوەی دڵە. خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿**أومن كان ميتاً فأحييناه وجعلنا له نوراً يمشى بة فى الناس كمن مثلهُ فى الظلمات ليس بخارجٍ منها**﴾ (الأنعام: ١٢٢) واتە: (ئایا کەسێك کە بە هۆی _ کوفر و گومڕایەوە هەروەك _ مردوویەك بووە و ئێمە ئەومان _ بە بەخشینی باوەڕ لە بەرجووی قورئان _ زیندوو کردۆتەوە و نووری باوەڕ لە ڕێگاکەیدا داناوە کە لە پەرجووی ئەودا لە نێوان خەڵکیدا ڕێ ببڕێت _ وەکو کەسێکە کە لە تاریکی _ ستەم و کوفر و پەشیمان بوونەوە _ ون بووە و لەو تاریکیانەدا ناتوانێت بێتە دەرەوە). بە هۆی گرنگی سەلامەتی و تەندروستی دڵە کە خوای گەورە چەند جار لە قورئاندا ژیان و دەروشانەوەی دڵ و هەروەها لە بارەی مردن و ستەمی دڵ باسی دەکات و دەفەرموێت: ﴿**لينذر من كان حياً ويحق القول على الكافرين**﴾ (يسن: ٧٠) واتە: (تا بە کەسانێك کە دڵیان بەخەبەر و زیندوون خۆف بدات و لەسەر بێباوەڕان _ و پێویستیەکان کۆتاییان پێ بێت _ ئەو کاتە فرمانی سزا _ دڵنیا و ڕاستی دەبێت).

﴿**ياايها الذين امنو استجيبوا لله و للرسول اذا دعاكم لما يحيكم و اعلموا ان الله يحول بين المرء و قلبه و انه اليه تحشرون**﴾ (الأنفال: ٢٤)

واتە (ئەی ئیمانداران فرمانی ئیلاهیی قەبوڵ بکەن و دەستوری پێغەمبەری ئەو (ﷺ) وەربگرن کاتێك کە ئێوە بۆ شتێك دەعوەت دەکات کە بە ئێوە ژیانی _ ماددی و مەعنەوی و دنیایی و ئاخیرەت _ دەبەخشێت و بزانن کە خوا نیوان مرۆڤ و دڵ جیا دەکاتەوە و بزانن کە هەموان لە بەردەم خوای توانا ، کۆ دەکرێنەوە).

﴿**یخروج الحی من المیت ویخرج المیت من الحی**﴾ (الروم: ١٩) واتە: (هەروەها خوا زیندوو لە مردوو و مردوو لە زیندوو دروست دەکات). مەبەست ئەمەیە کە خوا باوەڕدار لە بێباوەڕ و بێباوەڕ لە باوەڕدار دروست دەکات. لە فەرمودەیەکی صحیحدا هاتوە کە دەفەرموێت: ((**مثل البیت الذی یذکر الله فیە و البیت الذی لایزکر الله فیە کمثل الحی والمیت**)) واتە: ((وەکو خانویەك کە لە ناویدا زیکر و بیری خوای گەورە بکرێت و خانویەك کە لەناویدا زیکرو بیری خوا نەکرێت وەکو زیندوو و مردووە)). و لە فەرمودەیەکی صحیحیتردا هاتوە کە: ((**اجعلوا من صلاتکم فی بیوتیکم و لا تتحزوها قبورا**)) واتە: ((هەندێك لەنوێژەکانتان _ مەبەست لە نویژی سونەتە _ لە ماڵەکانتان بخوێنن و خانوەکانتان مەکەنە قبرستان)).خوا دەفەرموێت: ﴿**والذین کذبوا بایاتنا صمٌ وبکمٌ فی الظامات**﴾ (الأنعام: ٣٩) واتە: (ئەوانەی کە ئایەتی _ دنیا و قورئانی _ ئێمە بە درۆ دەزانن ئەوا ئەوانە کەڕ و لاڵن و لە تاریکیدا ژیان دەبەنە سەر).

هەروەها خوا لە جێگایەکیتردا لە قورئاندا نیشانەی نوور و ستەمی باس کردووە و دەفەرموێت: ﴿الله نور السماوات والأرض مثل نوره كمشكاة فيها مصباح المصباح في الزجاجة كأنها كوكب دُري يوقد من شجرة مباركة زيتونةٍ لا شرقيه ولا غربيه يكاد زيتها يضيء ولو لم تمسسهُ نار نورٌ على نورٍ﴾ (النور: ٣٥) واتە: (هەر خودایە نوور و ڕوناکی ئاسمانەکان و زەوی، دروستکراوەکان هەموو بە نووری ئەو ڕێ دەرئەکەن، نوور و ڕوناکی ئەو خودایە وەك تاقێکە کە چرایەکی گەورەی پرشنگداری پڕ نووری تێدا هەڵکرا بێت چراکەش لە ناو چوارچێوەیەکی پاکی دروشاوەی شوشەیەکدا بێت شوشەکەش وەك ئەستێرەیەکی پرشنگدار و گەش بێت _ چراکە لە دار (زیتونێکی) بەفڕ و بەبەرەکەت ڕۆن و سوتەمەنیەکەی وەربگیری _ دارەکەش نە هەمیشە لەبەر خۆرە نە هەمیشەش لە نزار و سێبەردایە ڕۆنەکەشی ئەوەندە پاکژ بێت نزیك بێت هەر لەخۆیەوە گڕ بگرێت بێ ئەوەی ئاگریشی بەرکەوەێ، ڕوناکی لەسەر ڕوناکی _ تاقەکە _ شوشەکە_ زیتە پاکەکە _ ئەمانە هەمووی زێدە ڕوناکی بریقەی چراکە بێگومان خودا ویستی لەهەر کەسێك ببێت ئەوا ڕێنمونی ئەکات بۆ نوور و ڕوناکی خۆی و خودا هەمیشە نمونە دێنێتەوە بۆ ئەوەی باشتر و چاکتر تێبگەن و خودا بە هەموو شتێك زاناو ئاگادارە). ئەمە هەر ئەو نمونەی نووری ئیمانە لە دڵی ئیماندارانی ڕاستیداو پاشان دەفەرموێت ﴿والذين كفروا أعمالهم كسراب بقيعة يحسبه الظلمات مأن حتى اذا جاءه لم

**يجده شيئا ووجد الله عند فوقاه حسابه والله سريع الحساب * أو كالظلمات في بحر لجي يغشاه موج من فوقه موج من فوقه سحاب الظلمات بعضها فوق بعض اذا أخرج يده لم يكد يراها ولم يجعل الله له نورا فما له من نور﴾** (النور: ٤٠) واتە (کرداری کافران وەکو سەرابێکە کە لە بیابانی بێ ئاو و گژوگیا کەسێکی تینوو بە ئاوی دابنێت بەڵام کاتێك بە دوای ئەودا دەڕوات هیچ شتێك پەیدا ناکات مەگەر خوا _ بیمرێنێ و _ بە هاواری بگات و سزای ئیش و کاری بە تەواوی بدات. خوا بە حیساب گەیشتن خێرایە یان کرداری ئەوان وەکو تاریکیەکە لە دەریایەکی قووڵدا ڕووبەڕوو بێت کە شەپۆلە گەورەکان ئەویان گرتبێت لەسەر ڕووی ئەوانەوە شەپۆلێکی گەورەتر هەبێت و لەسەر شەپۆلەکانەوە هەورێکی تێر ڕەنگ بێت تاریکیەکان یەك لەسەر یەك دانراون _ بەو شێوەیە ترس و خۆفێك دروست بوو بێت کە مووسا فێری دەریا _ هەرکات دەستی خۆی دەربێنێت _ و چاوان بگێڕێت بەهۆی تاریکی و ترسەکانی دەرەوەی دڵ جێگای جووڵاوی دەروون _ قابیلی نیە کە ئەوە ببینێت و کەسێك کە خوا نووری بەهرەی نەکردبێت ئەوا ئەو نوورێکی نیە تا بەهۆیەوە بەرەو ڕێگای ڕاستو هیدایەت ڕێنمایی بکات). ئایەتی یەکەم وەکو بیروباوەڕێکی بێ کەڵك (فاسد) و کردارێکی ناڕەوایە کە سەر بەم بیروباوەڕە بێ کەڵکە بێت. کە خاوەنی ئەو کردارە بێ کەڵکە وا بیر دەکاتەوە کە بە ئەنجامدانی ئەم کردارە سوودێکی پێ دەگات. بەڵام کاتێك بە سزای

کردەوەکانی دەگات هیچ شتێك پەیدا ناکات کە قابیلی سوود بێت. و خوا بەشێوەی تەواو بە حیسابی کردەوەکانی دەگات. ئایەتی دووەم وەکو کەسێکە کە خاوەنی نەزانیەکی ڕەها بووە و بێباوەڕ و نەزان بێت و کەسێکە خاوەن سیفەتگەلێکی ئاوا بێت ئەوا لە تاریکی لە دوای تاریکیدایە و حەق و ڕاستی نابینێت. لەبەرئەوەی بە نووری ئیمان و زانستەکەی چاوەکان دەکرێتەوە و دەبینێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**إن الذين اتقوا اذا مسهم طائف من الشيطان تذكروا فإذاهم مخسرون**﴾ (الأعراف: ٢٠) واتە: (پارێزکاران کاتێك کە گرفتاری و وسوەسەکانی شەیتان دەبن بە یادی _ دژایەتی و فێڵی ٛشەیتان و سزا و پاداشتی خوا _ دەکەون و چاویان دەکرێتەوە). و هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**ولقد همت به وهم بها لولا أن رأى برهان ربه**﴾ (یوسف: ٢٤) واتە: (زلێخا _ حەزی یوسفی (علیه السلام) کرد و یوسف (علیه السلام) حەزی لەو کرد _ بەڵام برهان (بەڵگەی) خوای خۆی بینی و گەڕایەوە). و ئەم بەڵگەیە هەر ئەو بەڵگەی ئیمانە کە خوا لە دڵی یوسفدا (علیه السلام) دورستی کردو ئەوی لە نزیکبوونەوە لە زلێخا گەڕاندەوە و بەردەمی حەزو ئیرادەی ئەوی گرت و بەهۆی ئەوەوە خوا پاداشتێکی تەواوی بۆ یوسف (علیه السلام) دانا و هیچ گوناهێکی بۆ نەنووسی. لەبەرئەوەی کە یوسف (علیه السلام) بە کاریگەری ئیمانەکەی کردەوەیەکی خێری ئەنجامدا ئەویش بە _ نزیك

نەکەوتنەوە لە زلێخا _ و لەو کارە خراپە _ نزیکی لەگەڵ زلێخا _ دوورکەوتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**أنزلناه إليك لتخرج الناس من الظلمات إلى النور**﴾ (ابراهيم: ١) واتە: (قورئانمان لەسەر نازڵ کرد تا ئەوەی کە خەڵکی لە تاریکی و کوفرو بێ دینی _ بەرەو نوور _ ئیمان و خوا پەرستی _ بهێنێ). و هەروەها دەفەرموێت: ﴿**الله ولى الذين آمنوا يخرجهم من الظلمات إلى النور والذين كفروا أولياؤهم الطاغوت يخرجونهم من النور إلى الظلمات**﴾ (البقرە: ٢٥٧) واتە: (خوا هەڵگری بەڵێنەکانی کاروباری کەسانێکە کە ئیمانیان هێناوە ئەمانە لە تاریکیەکان وەدەر دەهێنێ و بەرەو نوور ڕێنمایی دەکات. بەڵام کەسانێك کە شیرکیان کردووە، تاغوتەکان _ شەیتانەکان و بانگخوازانی خراپە و ستەم _ سەرپرشت و بەرپرسی ئەمانەن، ئەوانەی لە نوور دوور خستۆتەوەو بەرەو تاریکیەکان کێش دەکات).

﴿**ياأيها الذين أمنوا اتقوا الله وأمنوا برسوله يؤتكم كخليف من رحمته ويجعل لكم نورا تمشون به**﴾ (الحديد: ٢٨) واتە: (ئەی کەسانێك کە لە ئەهلی کتێبن و بە خواو پێغەمبەرانی ئیسلامی و کتێبەکان و تەورات و ئینجیل _ باوەڕتان هێناوە، لە خوا بترسن و بە پێغەمبەری ئەو _ موحەمەد بن عەبدوڵلا (ﷺ) کۆتایی پێغەمبەرانیش باوەڕ بهێنن تا خوا دوو پاداشت لە ڕەحمەتی خۆی بە ئێوە بدات _ یەکێ پاداشتی ئیمان بە عیسی (علیه السلام) و

کردەوەکانی دەگات هیچ شتێك پەیدا ناکات کە قابیلی سوود بێت. و خوا بەشێوەی تەواو بە حیسابی کردەوەکانی دەگات. ئایەتی دووەم وەکو کەسێکە کە خاوەنی نەزانیەکی ڕەها بووە و بێباوەڕ و نەزان بێت و کەسێکە خاوەن سیفەتگەلێکی ئاوا بێت ئەوا لە تاریکی لە دوای تاریکیدایە و حەق و ڕاستی نابینێت. لەبەرئەوەی بە نووری ئیمان و زانستەکەی چاوەکان دەکرێتەوە و دەبینێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**إن الذين اتقوا اذا مسهم طائف من الشيطان تذكروا فإذاهم مخسرون**﴾ (الأعراف: ٢٠) واتە: (پارێزکاران کاتێك کە گرفتاری و وسوەسەکانی شەیتان دەبن بە یادی _ دژایەتی و فێڵی شەیتان و سزا و پاداشتی خوا _ دەکەون و چاویان دەکرێتەوە). و هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**ولقد همت به وهم بها لولا أن رأى برهان ربه**﴾ (یوسف: ٢٤) واتە: (زلێخا _ حەزی یوسفی (علیه السلام) کرد و یوسف (علیه السلام) حەزی لەو کرد _ بەڵام برهان (بەڵگەی) خوای خۆی بینی و گەڕایەوە). و ئەم بەڵگەیە هەر ئەو بەڵگەی ئیمانە کە خوا لە دڵی یوسفدا (علیه السلام) دورستی کردو ئەوی لە نزیکبوونەوە لە زلێخا گەڕاندەوە و بەردەمی حەزو ئیرادەی ئەوی گرت و بەهۆی ئەوەوە خوا پاداشتێکی تەواوی بۆ یوسف (علیه السلام) دانا و هیچ گوناهێکی بۆ نەنووسی. لەبەرئەوەی کە یوسف (علیه السلام) بە کاریگەری ئیمانەکەی کردەوەیەکی خێری ئەنجامدا ئەویش بە _ نزیك

نه‌كه‌وتنه‌وه له زلێخا _ و له‌و كاره خراپه _ نزیكی له‌گه‌ڵ زلێخا _ دووركه‌وتـه‌وه. خـوای گـه‌وره ده‌فـه‌رموێت: ﴿**أنزلنـاه إليـك لتخـرج الناس من الظلمـات إلى النـور**﴾ (ابراهيم: ١) واتـه: (قورئانمان له‌سه‌ر نـازڵ كـرد تـا ئـه‌وه‌ی كـه خـه‌ڵكی لـه تـاریكی و كـوفرو بـێ دینـی _ بـه‌ره‌و نـوور _ ئیمـان و خـوا په‌رسـتی _ بهـێنیٚ). و هـه‌روه‌ها ده‌فـه‌رموێت: ﴿**الله ولی الـذين آمنـوا يخـرجهم مـن الظلمـات إلى النـور والذين كفـروا أوليـاؤهم الطـاغوت يخرجـونهم مـن النـور إلى الظلمـات**﴾ (البقره: ٢٥٧) واته: (خوا هه‌ڵگری به‌ڵێنه‌كانی كاروباری كه‌سانێكه كه ئیمانیان هێناوه ئه‌مانه له تاریكیه‌كان وه‌ده‌ر ده‌هێنێ و به‌ره‌و نـوور ڕێنمـایی ده‌كـات. بـه‌ڵام كه‌سـانێك كـه شـیركیان كـردووه، تاغوتـه‌كان _ شـه‌یتانه‌كان و بـانگخوازانی خراپـه و سـته‌م _ سه‌رپرشـت و به‌رپرسـی ئه‌مانـه‌ن، ئه‌وانـه‌ی لـه نـوور دوور خستۆته‌وه‌و به‌ره‌و تاریكیه‌كان كێش ده‌كات).

﴿**يأيها الذين أمنوا اتقوا الله وأمنوا برسوله يؤتكم كخليف من رحمته ويجعل لكم نورا تمشون به**﴾ (الحديد: ٢٨) واته: (ئه‌ی كه‌سانێك كه لـه ئـه‌هلی كتـێبن و بـه خـواو پێغه‌مبـه‌رانی ئیـسلامی و كتێبـه‌كان و تـه‌ورات و ئینجیـل _ باوه‌ڕتـان هێنـاوه، لـه خـوا بترسـن و بـه پێغه‌مبـه‌ری ئـه‌و _ موحه‌مـه‌د بـن عه‌بـدوڵلا (ﷺ) كۆتـایی پێغه‌مبه‌رانیش باوه‌ڕ بهێنن تا خوا دوو پاداشت له ڕه‌حمه‌تی خۆی به ئێوه بدات _ یه‌كیٚ پاداشتی ئیمان به عیسی (عليه السلام) و

ئەوی تر پاداشتی ئیمان بە موحەمەد (ﷺ) و هەروەها بۆ ئێوە نورێك دروست بكات كە لەناو پەرجووی ئەودا بجوولێن).
لەبەرئەمەیە كە خوا بۆ ئیمان دوو نموونەی هێناوەتەوە: نموونەی یەكەم: وەكو ئاوێكە كە ببێتە مایەی ژیان و زیندەگی وەلیٚ كاتێك بە لافاو دەگۆڕێت و دەكەوێت جوولە لەسەر ئەو كەفێكی زۆر دەبینرێت

نموونەی دووەم: وەكو ئاگرێكە كە نوور و ڕۆشنایی هەبێت وەلیٚ كاتێك كانزایەكی لەسەر گەرم دەكەن و ئەو كانزایە دەخەنە بەهۆی گەرمی كانزاكەوە دەرهاویشتراوەكان لە ئاوەكە بەشێوەی كەف لەسەری كۆ دەبێتەوە. لەم دوو نموونەیەدا هەر دوو جۆر دەرهاویشتە دوای وەستانەوەی ئاوەكە (لە نمونەی یەكەم) و ساردبوونەوەی ئاوەكە (لە نموونەی دووەم) لەناودەچن وەلیٚ ئاو و كانزا داغ بووەكە دەمێننەوە. لێرەدا ئەو كەفانەی لەسەر ئاوەكەن وەكو شیرك و ناڕەوا وایە كە هەمووكات دەڕۆن و ئاو و كانزاكە وەكو ئیمان و حەقیقەتە كە هەمیشە سەربەرزانە دەمێنێت.
خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أنزل من السماء ماء فسألت أودية بقدرها فاحتمل السيل زبدا كذلك ومما يوقدون عليه في النار ابتغاء صليه أو متاء زبد مثله كذلك يضرب الله الحق والباطل فأما الزبدو فذهب جفاء وأما ينفع الناس فمكث في الأرض كذلك يضرب الله الأمثال﴾ (الرعد: ١٧)
واتە: (خوا لە هەورەكانی ئاسمان ئاو دەڕژێنێتە خوارەوەو چەمو

ڕووبارەکـــان هەریەکـــە بـــە ئەنـــدازەی قـــەبارەی خـــۆی _ بـــۆ سەوزبوونەوەی گژوگیا و بەروبوومی دارودرەخت لە ئاوی ئەو _ لە خۆیدا جێگە دەکاتـەوە. و لەسـەر ئەم لافاوە کـەف گـەلێکی زۆر بێ سوود هەن، هەروەك ئەوەیە ئەوەی لە زێڕ و زیـو و شتی تـر بۆ ڕووکەش لەسەر ئاگرێکا دێن و دەیتوێننەوە. کەفێك هـەروەك کـەفی ئاو دروست دەکەن _ پەروەردگار بۆ ڕەواو ناڕەوا نموونەی‌یەکی ئاوای هێناوەتەوە _ بەڵام کەفەکان بێ سوودو بێ هوودە بوون و لە زووترین کات _ دوور دەکەونەوە بێ ئەوەی بۆ خەڵك بەسوودە لە زەوی دەمێنێتەوە خوا نموونەیەکی وا دەهێنێتەوە) لەم ئایەتە پـیرۆزەدا بیروبـاوەڕی نـاڕەوا هـەروەك کـەف و خـۆڵ و خاشـاکی لەسـەر ئـاو و کانزاکـان پێناسـە کـراوە کـە زۆر بـە زوویـی لـەناو دەچێت. بـەڵام ئایینـە ڕاسـتی‌یەکانی ئاسمـانی، وەك ئـاو و زێـڕ و زیو بەسوودن و دەمێنێتەوە.

خوا لە وەسفی دوو ڕووەکاندا دەفەرمووێت: ﴿**مثلهم كمثل الذى استوقد نارا فلما أضاءت ماحوله ذهب ما حوله الله بنورهم و تـركهم فـى ظلمات لا يبصرون * صمٌ بكمٌ عمىٌ فهم لا يرجعون * أوكصيبٍ مـن الـسماء فيه ظلماتٌ ورعدٌ وبرق يجعلون أصابعهم فـى آذانهـم مـن الـصواعق حـذر المـوت والله محـيطٌ بالكـافرين**﴾ (البقـرة: ١٧- ٢٠) واتـە: (داسـتانی ئەمانـە هـەروەك داسـتانی کەسـێکە کـە بـە هـەوڵ و کۆشـشی زۆر ئاگرێـك هەڵبگیرسـێنێ _ تـا خـۆی و هاوڕێکـانی _ سـوودی لێ وەربگـرن _ ئـەو کـات ئـاگرێکی دوور لـە سـەر ئـەو و پـەروەردگار

ئاگری ئەوان لە ناو ببات و خامۆش بکات. و ئەمانە لە تاریکی زۆردا ڕزگار بکات، بە جۆرێك کە چاوانیان شتێك نەبینێت. ئەوانە هەروەك کەڕ و لاڵ و کوێرەکانن و بەرە و حەق و ڕاستی ڕێگای گەڕانەوەیان نیە. یان ئەوە کە داستانی ئەمانە وەکو داستانی کەسانێکن کە لە بارانێکی بەلێزمە بەگیر هاتبن کە لە ئاسمان دێتە خوارەوە و لە ناو ئەو ئاپۆڕە تاریکیانە و هەورە بروسکە بووبن، و لە ترسی مردن پەنجەکانی خۆیان ببەن بە ناو گوێیاندا تا لە دەنگی سایقە لە ئەماندابن. نازانن کە خوا لە هەر لایەکەوە پەراوێزی خستوون. و هەرکات و لە هەر شوێنێك کە بیەوێت لە ناویان دەبات. وەك ئەوەیە کە بڵێ ئاسمان دەیەوێت نووری چاوانیان ببات. هەرکات کە _ بەردی ئەمانە _ ڕۆشن دەکات بەرەو پێش دەچن. و ئەگەر _ چواردەوری _ ئەمانە تاریك بێت لەسەر جێگای خۆیان دەمێنن. و ئەگەر خوا ویستی لەوە بوایە کە گوێ و چاوانی ئەمانە لە ناو ببات چونکە خوا لەسەر هەموو شتێك دەسەلآت و توانایی هەیە).

لەم ئایەتەدا خوا دوو ڕووەکانی بە کەسێك شوبهاندووە کە دەیەوێت ئاگر بکەنەوە و هەر کاتێك کە ئاگرەکە دەکەنەوە خوا دەی کوژێنێتەوە و یان ئەوانی شوبهادووە بە بارانێك کە لەسەر یەك و بەردەوام دەبارێت و لە هەمان کاتدا تاریکی و هەورەکان و هەورە بروسکە ئەوانی گرتبێت و ناتوانن ڕێگاکە ببینن. لەبارەی

ئەمەوە نموونەی قورئانی و تەفسیری ئەوان لە شوێنێکی تر باس دەکەین. ولێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ژیان و درەوشانەوەی دڵ بە هۆی باوەڕوە دەبێتە ڕاستی و بەدەست دێت. هەروەك لە ڕاز و نیازی مەئسوردا هاتووە کە دەڵێت: ((اجعل القران ربیع قلوبنا و نور صدورنا)).

واتە: ((خوایا! قورئان بکە بە بارانی بەهاری دڵەکانمان و نووری سنگمان)) ربیع هەر ئەو بارانەیە کە لە ئاسمان دەبارێت و بە هۆی ئەوەوە گژوگیا دەڕوێت. هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((ان مما بنت الربیع ما یقتل صبط اویلم)). واتە: ((ئەوەی کە بەهار دەی ڕوێنێت ئەو ئاژەڵان لە ناو دەبات و نە ئەوان نزیکی مردن دەکاتەوە)). و عەرەب وەرزێك کە لەودا یەکەم باران ببارێت بە ربیع (بەهار) ناوی دەبن و بە هۆی ئەوەی کە باران زۆر دەبارێت و گژوگیا سەوز دەکات. ولێ جگە لە عەرەب وەرزێك کە لە دوایی زستانەوە دێت بە بەهار ناوی دەبن و لەو وەرزەدا دار و درخت چرۆ دەکەن و لەوان میوە پەیدا دەبێت و گەڵای داران دەردێن.

# دڵی زیندوو

دڵی زیندوو دڵێکە کە بەهێزبێت و لەودا نوری ئیمان و چرای هیدایەت وجوودی هەیە. ئەو بە باشی دەبیستێت و دەبینێت و بیردەکاتەوە و لە خاڵی بەرامبەردا دڵی مردوو هەیە. لەو ڕووەوە کە ستەمی نەزانی و نەفامی زاڵبووە بەسەریدا. نابیستێت و نابینێت و بیرناکاتەوە خوا دەفەرموویێت: ﴿ومثل الذين كفروا كمثل الذى ينعق بما لايسمعُ إلا دعاءً ونداءً صمٌ بكمٌ عمىٌ فهم لا يعقلون﴾ (البقرة: ١٧٠) واتە: (نموونەی کەسانێك کە شیرکیان کردووە وەکو کەسێکە کە _ شوانی مەڕ بێت _ بانگیان لێ بکات وەلێ ئەوان جگە لە دەنگەدەنگ شتێکی تر نەبیستن. موشریکانیش وەکو کەڕ و لاڵ و کوێرەکانن و چونکە ئەمانە بە چاکەکاری کرداریان ئەنجام نادەن نەفام و نەزانن).

﴿ومنهم من يستمعون اليك أفأنت تسمعُ الصم ولو كانوا لا يعقلون * ومنهم من ينظرُ أفأنت تهَدى العُمى ولوكانوا لا يعلمون﴾ (يونس: ٤٣) واتە: (کۆمەڵێك لەوان گوێ بۆ تۆ دەگرن، کاتێك کە قورئان دەخوێنی یان ئەو ئایەتە تازانە کە لە خواوەیە بەیان دەکەی، بەڵام

گوایــە شــتێك نابیــستن و کــەڕن، ئایــا تــۆ دەزانــی قــسانی خــۆت بگەیەنی بە گوێی کەڕان هەر چەندە تێنەگەن. و کۆمەڵێك لەوان _ سەیری تۆ دەکەن _ و لە بارەی تۆوە بیردەکەنەوە و دلیل و نیشانەی ئاشکرای پێغەمبەرایەتی تۆ هەست پێدەکەن و دەزانن و بەڕاستی لە ئیسلام دەگەن بەڵام وەك ئەوەی کە شتێك نازانن و نابینن، ئایا تۆ دەتوانی کوێرەکان ڕێنمایی بکەی هەر چەند نابینن و کەم فام و نەزان بن).

﴿ومنهم يستمع اليك وجعلنا على قلوبهم اكنـة أن يفقهـوهُ وفـى آذانهـم وقراً وإن يروا كلَ آية لايؤمنوا بها حتى إذا جاؤك يجادلونك يقـول الـذين كفروا إن هذا إلاّ أساطيرُ الأولـين﴾ (الأنعام: ٢٥) واتـە: (هەندێك لەوان کاتی قورئان خوێندن _ گوێ بۆ تۆ دەگرن _ نەك بۆ تێگەیشتن و هیدایەت، بەڵکو بۆ تەعلیق لێدان و گاڵتە پێکردن. هەر لەبەر ئەو هۆیە ئەوانمان لە سوود وەرگرتن لە عەقڵ و فکر و گوێ بێبەش کردووە وەك بڵێی کەڕن، ئێمە پەردەیەکمان لەسەر دڵەکانیان داناوە تا لەو تێ نەگەن و لە گوێ کانیاندا کەڕیمان داناوە، تا دەنگی ئاسمانی قورئان نەبیستن. ئەگەر ئەوان هەموو نیشانە و دەلیلەکانی حەق و ڕاستیش ببینن ئەوا باوەڕی پێ ناهێنن و ئیمان ناهێنن. تا کاتێك کە بۆ گوفتوگۆ دێنە پێشەوە بۆ لای تۆ دەڵێن: (ئەمانە کە تۆ بە سەر ئێمەدا دەیخوێنی جگە لە ئەفسانەی پێشینان هیچی تر نیە). ئەم ئایەتانە، ئاماژە بەوە دەکات کە

بێباوەڕان کاتێك کە دڵیان مردووە و بیرناکەنەوە. و دڵیان سەبارەت بە هیدایەتی ئیلاهی هیچ جۆرە بیر و هزرێك ناکەنەوە و گوێ کانیان ڕاستی نابیستن و لە حەقیقەت و ڕاستی ناگەن.

ئەمانە بەتەواوی گومڕان. خوا لە زمانی ئەوانەوە دەفەرمووێت: ﴿**قلوبنا فی أکنة مما تدعونا إلیه وفی آذاننا وقرٌ ومن بیننا وبینك حجابٌ**﴾ (الفصلت: ٥) واتە: (دەڵێن: دڵەکانمان لە بەرامبەر شتێك کە بانگهێشتی دەکەیت _ پەرستنی خوای تاك و تەنهایە_ لە نێوان پۆشەرێکدایە و ئەوەی کە دەیڵێیت پێیناگات، و گوێکانمان قورس و سەنگینن، و ووتەکانی تۆ نابیستن، و لە نێوان ئێمە و تۆدا پەردەیەکی ئەستوور و بەربەستێکی گەورە هەیە، کە ناهێڵێت ئێمە لەگەڵ تۆ لە شوێنێکدا کۆ ببێتەوە). بێباوەڕان ئەو پەردانەی کە لەسەر دڵ و گوێ و چاوەکانیانە باسی دەکەن لاشەیان زیندووە و دەبیستن و دەبینن بەڵام، ژیانیان وەکو ژیانی ئاژەڵانە. لەبەر ئەوەی کە وەکو ئەوان بە هەستی دەرەوەیان دەبیستن و دەبینن و دەخۆن و دەخۆنەوە و بەشتی لاوەکی و شەهواتی خۆیان خەریك دەبن، لەو حاڵەدا لە ڕووی ژیانی مەعنەویەوە مردوویەك زیاتر نین، و لەبەر ئەوە خوا دەفەرمووێت: ﴿**ومثل الذین کفروا کمثل الذی ینعق بما لا یسمع إلا دعاءً ونداءً**﴾ (البقرة: ١٧١) واتە: (نموونەی کەسانێك کە شیرکیان کردووە وەکو کەسێکە کە _ شوانی مەڕ بێت _ بانگیان لێ بکات وەلێ ئەوان جگە لە دەنگەدەنگ شتێکی تر

نابیستن). هەروەها خوا لە وەسفیاندا دەفەرمووێت: ﴿**ام تحسب أن أكثرهم يسمعون أو يعقلون ان هم الا كالانعام بل هم أضل سبيلا**﴾ (الفرقان: ٤٤) واتە: (ئایا گومان دەبەیت کە زۆرێك لەوان بەو شێوەیە بن کە دەبا _ ببیستن یا تێنەگەن، نەك ئەوانەی کە بیر و هزرو هۆشیان نیە _ ئەمانە هەر وەك چوار پێن و بەڵکو گومڕاتریش لەوان).

﴿**ولقد ذرأنا لجهنم كثيرا من الجن و الانس لهم قلوب لايفقهون بها ولهم أعينٌ لا يبصرونَ بها ولهم آذانٌ لايسمعونَ أولئك كالأنعام بل هم أضل أولئك هم الغافلون**﴾ (الأعراف: ١٧٩) واتە: (ئێمە زۆرێك لە ئادەمیزادمان دروست کردووە. لە دونیادا _ پەرش و بڵاومان کردوون کە سەرەنجامی ئەوان، جەهننەمە _ ئەمە لەبەر ئەوەیە کە _ ئەوان دڵێکیان هەیە کە لە ئایاتی ڕێنمایی کماڵ _ تێناگەن نیشانەکانی خوای و یەکتاپەرستی. نابیستن و گوێیانێکیان هەیە کە بەوان _ ڕووداو و بە سەرهات و پەند گەلێك کە ژیان دروستیان دەکەن نابیستن _ ئەمانە لەبەر ئەوە لەم بەشانە بەو شێوە کە پێویستە سوود وەرناگرن و قازانج و زیانەکانی خۆیان لەیەك جیاناکەنەوە _ لەبەر ئەوەی کە چوار پێکان لە سوننەتی فیترەت زیاتر پێ ڕاناکێشن وەڵێ ئەمانە ڕێگای توندڕەوی و زۆر ڕەوی دەگرنە بەر _ ئەمانە بەڕاستی بێئاگان لە خێر و چاکەی دینا و ئاخیرەتی خۆیان). سەرنج بدەن لەم ئایەتەی خوارەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿**واذا مس الانسان الضر دعانا لجنبه أو قاعداً أو**

قائماً فلما كشفنا عنه ضرَهُ مر كأن لم يدعنا إلى ضر مسهُ﴾ (يونس: ١٢)

واتە: (کاتێ کە ناڕەحەتی و بەلاّ و موسیبەت دێتە سەر ڕێی مرۆڤ کە نەخۆی و نە خەڵکانیتر ناتوانن چارەسەری بکەن _ چ بە ڕاکشان و چ بە دانیشتن و وەستانەوە بێت _ بۆ چارەسەر بوونی کێشە داوای یارمەتی و هاوکاری لە ئێمە دەکات. بەلاّم کاتێ ناڕەحەتی و بەلاّیەك _ کە لەبەرامبەریدا بەچۆکدا هاتبوو _ بۆمان چارەسەر کرد ئەوا دوبارە دەگەڕێتەوە بۆ ڕێگای پێشینەی کە گوایا ئێمە بۆ چارەسەری کێشەیەك کە هاتبوو بەسەریدا بەدەمیەوە نەهاتووین و فریای نەکەوتووین. و ئەسڵەن زەرەر و زیانێك بەو نەگەشتووە و هیچ بەلاّیەکی بە سەردا نەهاتووە).

هەندێك لە موفەسیران لە بارەی ئەم ئایەتە و ئەوانەی وەکو ئەم ئایەتەن دەڵێن: ((هەرچەند کە خوا لەم ئایەتانەدا. عەیب و کەم و کورتیەکانی مرۆڤی دەرخستووە و باسی کردووە و ئەوانی خستۆتە ژێر ئامۆژگارییەوە بەلاّم ئەم ئایەتانە لە بارەی موشیرکانەوە هاتوون و مەبەست لە مرۆڤ لەم ئایەتانەدا هەر ئەو مرۆڤە بێباوەڕانەیە)).

کەواتە کەسی موسڵمان کە ئەم جۆرە تەفسیرە دەبیستێ خەیاڵی ئاسوودە دەبێت و دەڵێن: ((وتاری ئەم جۆرە ئایەتانە کەسی موسڵمان ناگرێتەوە و ئەم ئامۆژگاری و بەڵێن و سزایانە بۆ موسڵمانان نین. بەڵکو ئەم ئایەتانە لە بەرامبەر بێباوەڕانی عەرەب

و جوولەکــە و مەســیحی و مەجووســیەکان و بێبــاوەڕانی هینــد و نموونەی ئەوان ڕاستی پەیدا دەکات. دەبێ بوترێت کە ئەم جۆرە تەفسیر و باسانە، باسکردنی دەقیـق نـەبووە و جگـە لـە وەهـم و گومان هیچی تر نین. لەبەر ئەوە:

یەکـەم: لـە نێـوان کەسـانێك کـە خۆیـان بـە موسـڵمان دەزانـن باوەڕدار و دووڕو هەیە. و دووڕووەکان هاتوونە ناو موسڵمانانەوە کە جێگای ئەوانە خوارترین جێی ترسناکی جەهەننەمە.

دووەم: لەوانـە مـرۆڤ لەگـەڵ ئەوەشـدا بـاوەڕی هەیـە هەنـدێك لـە دووڕوی و کـوفر لـە وجوودیـدا ڕەگـی داکوتابێـت. بـەو شـێوە کـە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمووێت: ((اربع من كن فيه كان منافقا فالصا ومن كانت فيه خصلته منهم كانت فيه خصلته مـن النفـاق حتى يدعها: اذا حدث كذب و اذا ائتمن فان و اذا عاهـد غـدر واذا خاصـم فجر )).

واتـە: ((چوار سیفەت هەن کە لە هەر کەسێکدا هەبن ئەوا ئەو کەسـە دووڕوی تـەواوە و هـەر کەسـێك کـە یـەکێك لـەم سـیفەتانەی تێدا بێت ئەوا سیفەتێکی لە دووڕوی تێدایە مەگەر ئەوەی کە ئەو سیفەتە تەرك بکات و وازی لێ بهێنێ و ئەوانەش بریتین لە: لەکاتی قـسەکردندا درۆ بکـات. ئەگـەر ئەمانـەتێك لـە لای دابنـرێ ئـەوا خیانەتی تێدا دەکات. ئەگەر بەڵێن و پـەیمان بدات ئەوا پەیمانەکە دەشـکێنێ. و ئەگـەر شـەڕ بکـات ئـەوا جـوێن و ووشـەی نـاڕەوا

**دەڵێـت)). پێغەمبـەری خۆشەویـست(ﷺ) لـەم فەرموودەیـەدا بـە ڕوونـی و ئاشـکرای باسـی دەکـات کـە هـەر کەسێك سیفەتێك لـەم سـیفەتانەی تێـدا بێـت ئـەوا سـیفەتێك لـە دووڕوویـی تێدایـە و لـە فەرموودەی صحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بە ئەبو زەڕی[۲] فـەرموو: ((انـك أمـرؤ فيـك جاهليـه)) واتـە: ((لـە تـۆدا سیفەتی جاهیلی هەیە)). لە حاڵەتێکدا کە ئەبو زەڕ (خوای لێ ڕازی بێـت) لـە ڕاسـتگۆترین خـەڵکی بـوو لـە ڕووی بـاوەڕ و خـوا پەرستیەوە. و لە فەرموودەیـەکی تـری صحیحدا فـەرمووی: ((اربـع فی امنی من امر الجاهليـة: الفخـر بالاحـساب و الطعـن فـی الانـساب و البناصة و الاستقاء بالنجوم)). واتە: ((چوار شت لـە ئومەتی منـدا لـە سیفەت و ڕەوشتی جاهیلیەتن _ شانازی کردن بە باو باپیرانـەوە. تعلیق دان و گاڵتە کردن بە خزم و کەس و کار داواکردنـی بـاران لـە ئەستێرەکان)).**

**لە فەرموودەیەکیتری صحیحدا فەرموویەتی: ((لتتبعن سـنن مـن كان قلبكم حذو الغدة، حتى لو دخلوا جحر ضب لدخلتموه قالوا: اليهـود و النصاری؟ قال ضمن؟)) واتـە: ((ئێـوە لـە نـەریت و عـادەتی پێـشینان هەنگاو بە هـەنگاو پـەیڕەوی دەکـەن، تەنانـەت ئەگـەر ئـەوان چوونـە ناو کونی مارمێلکەیشەوە ئێوەش دەچنـە نـاوی. یـاران (ڕەحمـەتی**

---

[۲] ئەبو زەڕی غەفاری (ڕەحمەتی خودای لەسەر بێ) یەکێکە لەو کەسانەی کە یەکەم جار باوەڕی بە پێغەمبەر (ﷺ) ...، لە زانست و زهد و جیهاد و ڕاستگۆیی گوفتار و ئیخلاص پڕ بوو (انس بن مالك و زيد بن وهب لە ...سەکارانی بەناوبانگی ئەو بوون) لە ساڵی ۳۲ ه.ق ماڵئاوایی کرد.

**خوایـان لەسـەر) ووتیـان: ((مەبەسـتتان جوولەکـە و مەسـیحیە؟ فەرمووی: کەواتە جگە لەوان چ کەسێك؟!)).**

**هەروەها لە فەرموودەیەکی صحیحدا دەفەرمووێت: ((الناخذ امنی ما أخذت الامم قبلها شبرا بشبر و ذراعا بذراع، قالوا فارس و الروم؟ قال: ومن الناس الاهواء)).**

**واتـە: ((ئوممـەتی مـن بـست بـە بـست و هـەنگاو بـە هـەنگاو دەکەوێتە شوێنی ئوممەتەکانی ڕابردوو. واتە لە نەریت و عادەتی ئەوان لاسایی دەکەن. یاران (ڕەحمەتی خوایان لەسەر) ووتیان: مەبەست، فارس و ڕۆمە؟ فەرمووی: مەگەر جگە لەوان کەسێکی تر وجوودی هەیە؟)).**

**ابن ابی ملیکە دەڵێت: (نزیکەی ٣٠ کەس لە یارانی پێغەمبەرم (ﷺ) بینی ترسیان لە بوونی دووڕوویی بچوك لە خۆیان هەبوو. هەروەك لە علی یان حوزیفەی کوڕی یەمان (ڕەحمەتی خوایان لەسەر) ڕیوایەت کراوە دەڵێت: ((القلوب اربعة: قلب اجراد فيه سراج يزهر، فذلك قلب المؤمن، و قلب الخلف، فذالك قلب الكافر و قلب منكوس، فذلك قلب المنافق فيه مادتان: مادة تمده، فذلك قلب الكافر اجرد فيه سراج يزهر لاهولاء؟ من المنافق من يدعها: اذا حدث كذب و اذا أئتمن فان و اذا عاهد غدر و الايمان و مادة تمده النفاق، فاولئك قوم ظلموا عملا صالحا)).**

**واتە: ((دڵی خەڵکی چوار جۆرە:-**

١- دڵێك کە بێگەرد بۆ خوایە و لە ناویدا چرایەك هەیە کە درەوشاوەیە. چرای باوەڕ و ئەو دڵە باوەڕدارە.

٢- دڵێك کە پێچەوانەیە و گومڕایە و نوری زانست و باوەڕی پێناگات. و ئەوە دڵی بێباوەڕانە.

٣- دڵێك کە سەر لێشێواو و سەرەو و خوارە. و ئەوەش دڵی دووڕوەکانە.

٤- دڵێك کە لەیەك کاتدا دوو بەشی تێدایە. بەشی باوەڕ. بەشی دووڕو. کە لەم جۆرە دڵانە، کرداری چاك و خراپ لەگەڵ یەکدا تێکەڵ بوون. کەواتە لە ئەنجامدا هەر مرۆڤێکی موسڵمان دەتوانێت لە وەسف و ستایشی باوەڕ لەلایەن خواوە و لە سەرزەنشت و خراپی شیرك دووڕویی لەلایەن ئەوەوە سوود وەربگرێت. هەندێك لەبارەی ﴿اهدنا الصراط المستقیم﴾ (الفاتحە: ٦) واتە: ((خوایا! هیدایەتمان بدەی بۆ سەر ڕێگەی ڕاست، دەڵێن: باوەڕدار هیدایەت دراوە بە ڕێگەی ڕاست کەواتە سوودی داواکردنی هیدایەت کە لەم ئایەتەدا هەیە چیە؟ تاقمێك وەڵام دەدەنەوە دەڵێن: لەم ئایەتەدا مەبەست لەوەیە کە خوایا! ئێمە لەسەر ڕێگەی ڕاست بەردەوام بکە و بهێڵەرەوە. هەندێك دەڵێن: (مەبەست ئەوەیە کە خوایا! ئێمە لەسەر ڕێگەی هیدایەت پابەند بکە و یان هیدایەتی ئێمە زیاد بکە. دەبێ بووترێ: مەبەست لە هیدایەت لێرەدا کار کردن بە دەستوراتی ئیلاهی و تەرك کردنی ئەو کارانەی کە نەهی لێ کردوون)). مرۆڤ لەگەڵ ئەوەشدا کە باوەڕی بە پێغەمبەر (ﷺ) و ڕاستی قورئان بە شێوەی تەواو و بێ کەم و کوورتی هەبێت،

دیسانەوە پێویستە کردەوەیەك ئەنجام بدات کە بە هۆی ئەوانەوە بتوانێــت بەرژەوەندیــەکانی بناســێت و لــە زیانــەکانی دوور بکەوێتــەوە. و هــەروەها فــەرمان و نــەهی لێکراوەکــانی قورئــان و فەرمووده بناسێت، و هەندێك جار لەم ڕێگەیەدا مرۆڤ ناتوانێت تــەواوی مەبەســت و ئەهدافــەکانی شــەریعەت بەشــێوەی ڕاســت و دروســت تێبگــات. کەواتــە لــەم دڕندانــەدا پێویــستی زۆری بــە داواکردنی هیدایەتە لەم ڕێگە ڕاستە لە خوا و مانەوە لە سەری. ئاسایيە هیدایەت بە ڕێـی ڕاست پێویست بە ناسینی درێژەی شــتگەلێکیترە کــە پێغەمبــەری خۆشەویــست (ﷺ) هێناویــەتی. ناســینی تــەواوەتی ســەبارەت بــە فەرمانــەکانی قورئــانی پەیوەستبوونی کردار بەوانەوە هەر بەو شێوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردووە. دەبێ بزانرێت کە بە تاك دانان و زانینی حەق و ڕاستی هیدایەت بەدەست نایەت. وەك ئەوەی لە پەیمانی حودەیبیە لە حاڵێکدا زۆربەی موسڵمانان ئەویان بە قورس و نادروست دەزانی. خوا بە پێغەمبەری (ﷺ) فەرموو: ﴿**انا فتحنا لك فتحا مبينا * ليغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تاخر ويتم نعمته عليك ويهديك صراطا مستقيما**﴾ (فتح: ٢) واتە: (ئێمە سەر کەوتنێکی ئاشکرامان بۆ تۆ دروست کرد. مەبەست ئەمە بوو کە خوا لە گوناهی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بێت و بەنیعمەتی خۆی لەسەر تۆ تەواو بکات و هیدایەت بفەرمووێت بۆ ڕێگەی ڕاست). لەبارەی موسا و هارون (سەلامی خوایان لەسەر) دەفەرمووێت: ﴿**و اتيناهما الكتاب المستين و هديناهما الصراط المستقيم**﴾ (الصافات: ١١٨) واتە:

«و بەو دووانە کتێبی ڕۆشنگەری _ تەورات _ مان بەخشی و هیدایەتمان دان بۆ ڕێگەی ڕاست».

موسڵمانان کە یەك باوەڕن لەسەر ئەوەی کە موحەمەد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە و قورئان کتێبی ئیلاهیە وەڵێ لەگەڵ بوونی ئەمەشدا لە هەندێك لە بابەتەکاندا لەگەڵ یەکتر ڕای جیاوازیان هەیە. کەواتە ئەگەر هەموو ئەوانە بە هیدایەتێکی ڕاست و دروست هەنگاویان نابایە لەسەر ئەو ڕا جیاوازیانەی کە هەیانە ئەوا جیاوازییەکانیان کۆتایی پێ دەهات و لە ڕێگە و ڕێبازێك کە گرتوویانەتەبەر دەست بەردار دەبوون و دەگەڕانەوە و بەو شتەی کە بەوان فەرمان کراوە عەمەلیان دەکرد. و لەو شتەی کە نەهی کراوە دەستیان لێ هەڵدەگرن. بەڵام بەم شێوە نین کەواتە هەموو لەسەر حەق نین و پیاو چاکی ڕاستی کەسانێکن کە خوا ئەوانی بە ڕێگەی ڕاست هیدایەت کردووە و گەورەترین هیدایەتیان، هەر ئەم داواکردنەیانە کە لە نوێژەکانیاندا ئەڵێن: ﴿اهدينا الصراط المستقيم﴾ ئەوانە لەگەل ئەوەشدا کە دەیانزانی کە بەردەوام پێویستی و نیازمەندن بە دەرگای خوا بۆ هیدایەت بەرەو ڕێگای ڕاست. هەموو کات لەسەر ئەم پاڕانەوەیە بەردەوامیان هەبوو تا ئەوەی کە لە ڕیزی پیاو چاکانی خوا ژمێردران.

سەهل بن عەبدوڵلا تستری (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەڵێت: «هیچ ڕێگەیەك نزیکتر بە خوا نیە لە دەربڕینی نیاز و پێویست بەبێت. خوایەك لە ڕابردودا مرۆڤی هیدایەت داوە _ پێویستە کە بۆ ئیستا و داهاتووش بۆ مانەوە لە هیدایەت داوای یارمەتی لێ

بکرێت _ ئەمە مانای پەیڤی کەسێکە کە دەڵێت: خوایا ئێمە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست هیدایەت بفەرموو لە سەری وەستاومان بکە. کەسێك کە دەڵێت خوایا هیدایەتی ئێمە زیاد بکە، مەبەستی هەمان مەفهومە کە پێشتر باسمان لە بارەیەوە کرد. هەموو هیدایەتێك چ لە ڕابردو چ لە ئێستا و چ بۆ داهاتووش لە ژێر ئیرادەیی خوادا بووە و هەیە، کەواتە مرۆڤ دەبێ زانستێك کە خوا پێی بەخشیوە کاربکات تا بتوانێت هیدایەتی ئیلاهی لە ئێستا و داهاتوودا بکاتە نسیبی خۆی. خەڵکی هەموو پێویست و نیازمەندی ئەم پاڕانەوەیەن. لەبەر ئەوە خوا ئەم پاڕانەوەیەی لەهەریەك لە نوێژەکاندا واجب کردووە. کاتێك کە هیدایەت بە ڕێگای ڕاست بۆ مرۆڤ بە دەست هات ئیتر هاوکاری خوا و ڕۆژی پڕبەرەکەت و ئەوەی کە نەفسی ئەو بە شوێنی سەرفرازی و سەربڵندی دائمیدایە بۆی جێبەجێ دەبێت. و جوڵان لە ڕێی دڵدا بە خوا و گەیشتنی بە کەماڵی مەعنەوی لە مەرجی هیدایەتی حەق تعالی و بەردەوامی مرۆڤ لەم ڕێگایەدا سەرکەوتنە.

# ژیانی دڵ

دەبێ بزانرێت بەو شێوە کە هەندێك وادادەنێن کە ژیان بریتیە لە هەست و جوڵان و ئیرادە یان تەنها بریتیە لە زانست و دەسەلات. بەو شێوە کە حسن بصری و خەڵکی تر لە بارەی ژیانی پەروەردگار وتویانە ڕاست نیە. بەڵکو ژیان وسفێکە وەستاو و مەرجێکە بۆ زانست و دەسەلات و ئیرادە لە پێویستیەکانی ئەوانەدا. کەواتە هەر زیندەوەرێك شعوور و تێگەیشتن و ئیرادە و دەسەلاتی هەیە لەسەر کرداری هەڵبژێردراوی خۆی. و هەرشتێك کە زانست و ئیرادە و دەسەلات هەبێت لەسەر کرداری هەڵبژێردراوی ئەوا زیندووە.

شەرم و حەیاش لە ژیانەوە سەرچاوەی گرتووە و دڵی زیندوو دەبێتە هۆی ئەوەی کە خاوەنەکەی زیندوو و شەرم و حەیای هەبێت و لە ئیشە خراپ و ناپەسەندەکان دوور بکەوێتەوە. کەواتە ئەگەر دڵ زیندوو بێت ئەوا دەبێتە ڕێگر لە بەردەم ئیشە خراپ و ناپەسەندەکان کە دەبنە هۆی بێ کەڵك بوون بەو شێوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((**الحياء من الايمان**)) واتە: ((شەرم و

حەیا لە باوەڕەوەیە)). هەروەها دەفەرمووێ: ((**الحیاء و العی شعبتان من الایمان و البنداء و البیان شعبتان من النفاق**)) واتە: ((شەرم و حەیا و کەم قسە کردن، دوو بەشن لە باوەڕ و قسە گوتن بە ناڕەوا و زۆر بڵێی، دوو شتن لە دووڕوی)).

مرۆڤی زیندوو بە پێچەوانەی مرۆڤی مردووە، ئەوەی کە دەبێتە هۆی ئازار و ئەشکەنجەی لە خۆی دوور دەکاتەوە لە حاڵێکدا مرۆڤی مردوو و هیچ جووڵەیەکی نیە و ناتوانێت شتێك لە خۆی دوور بخاتەوە و لە کار کەوتوو بێ توانا و بێ بەهرە لە شادمانی و تازەگەری ژیاندایە. کەواتە دڵێك کە لە کار کەوتووە و بێ توانایە لەبەرامبەر شادمانی ژیان ووشك بووە و لە ناویدا ژیانێك وجوودی نیە وەکو زەوییەکی دێمە کە کێڵانیشی هیچ کاریگەرییەکی نیە _ بە پێچەوانەی زەوی سەوز و بەر ئاو کە کێڵانی دەبێتە هۆی لە ناو بردنی ئەو _ کەواتە خراپیەکان لەسەر دڵی زیندوو کاریگەریان دەبێت و ئەو دڵە زیندوو بە پێچەوانەی دڵی مردووەوە و بێ حەیایی کە نە ژیانێکی هەیە و نە باوەڕێك کە ببێتە ڕێگر لە بەردەمیدا. دەسەڵات و ئیرادە دەبنە هۆی بەربەست بۆ ئەنجامدانی کارە خراپ و ناپەسەندەکان. تەنانەت دڵێك کە زیندووە لەگەڵ مردنی لاشەیدا هەر دەتوانی بە زیندوویی بمێنێت و بەخیلیەك بە چاکەی ڕۆح لە لاشە نیشانەی مردنی ئەو دڵە نیە. بەو شێوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**ولاتقولوا لمن یقتل فی سبیل الله أموات**

**بل احیاء﴾** (البقرە: ١٥٤) واتە: (و بە کەسانێك کە لە ڕێگای خوا دەکوژرێن، دڵێن مردووە بەڵکو ئەوان زیندوون). و لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: **﴿ولا تحسبن الذین قتلوا فی سبیل الله أمواتا بل أحیاء﴾** (ال عمران: ١٦) واتە: (وکەسانێك کە لە ڕێگای خوادا دەکوژرێن بە مردووی دەزانن نەخێر، بەڵکو ئەوان زیندوون). لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوان مردوون و دەکەونە ژێر ڕاڤەی ئەم ئایەتانەوە: **﴿کل نفس ذائقة الموت﴾** واتە: (هەر نەفسێك دەبێ تامی مردن بچێژێ). و **﴿انك میت و انهم میتون﴾** (الزمر: ٣٠) واتە: (ئەی محەمەد(ﷺ) تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن). و **﴿وهو الذی أحیاکم ثم یمیتکم ثم یحیکم﴾** (الحج: ٦٦) واتە: (خوا کەسێکە کە ژیانی بە ئێوە بەخشیوە و دوایی دەتان مرێنێ و پاشان زیندووتان دەکاتەوە).

کەواتە مەرگی ئاسایی بە مانای جیا بوونەوەی ڕۆح لە لاشە لەگەڵ مەرگی نائاسیی کە لەناو چوونی ژیانە بە تەواوەتی کە ڕۆح و لاشەیە جیاوازی هەیە. هەر وەك خەویش جۆرێکە لە مەرگە و دەڵێن مردنە. لە حاڵێکدا لە هەر یەك لەم دوانە جۆرێك مەرگە یەعنی مەرگ بەمانای جیا بوونەوەی ڕۆح لە لاشە و مەرگ بە مانای خەو، ژیان وجوودی هەیە. لە یەکێکیاندا ژیانی مەعنەوی و لە یەکێکیتریاندا ژیانێکی ڕاستی خۆی حەشار داوە. هەر وەك خوا دەفەرموێت: **﴿الله یتوفی الانفس حین موتها و التی لم تمت فی**

**منامها فیمسك التی علیها الموت و یرسل الاخری الی أجل مسمی﴾** (الزمر: ٤٢). **واتە: (خوا ڕۆحەکان لە کاتی مەرگی مرۆڤەکان و خەوتنی ئەوان هەڵ دەگرێت. ڕۆحی کەسانێك کە فەرمانی ئەوانی دەرکردووە هەڵدەگرێت و ڕۆحی کەسانێك کە ئەجەلی خاوەنەکەیان نەهاتووە دەگەڕێتەوە بۆ لاشەکانیان تا کاتی دیاری کراو کە کۆتایی بە تەمەنیان دێت).**

**لەبەر ئەوەی کاتێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خەو هەڵدەستا ئەمەی دەوت: ((الحمد لله الذی أحیاناً بعد ما اماتنا و الیه النشور)) واتە: ((سپاس و ستایش بۆ خوایەك کە لە دوایی ئەوەی ئێمەی مژاند دوبارە زیندووی کردینەوە و بەرەو ئەو دەگەڕێنەوە)). لە فەرمودەیەکیتردا دەفەرموێت: ((الحمدلله الذی روحی و عافانی فی جسد و أذن لی بذکره و فضلنی علی کثیر ممن خلق تفضیلا)) واتە: ((سپاس بۆ خوا کە دوبارە ڕۆحی بۆ گەڕاندمەوە و سەلامەتی بەخشی بە لاشەم و ڕێی زیکر و یادی پێبەخشیم و گەورەیی و چاکی پێدام لە زۆرێك لە دروستکراوەکانی)).**

**هەر کاتێ دەچوویە سەر جێگا بۆ خەو دەی فەرموو: ((اللهم أنت خلقن نفسی و انت توفاها، لك مماتها و معیاها، ان امسکتها فارصمها، و ان ارسلتها فاحفظها بما تحفظ، به عبادك العالمین)) واتە: ((ئەی پەروەردگار! تۆ منت دروست کردووە و دەمرێنی مردن و زیندوو بوونم بۆ تۆیە و ئەگەر نەفسمت گرت ئەوا ڕەحمی پێ بکە و ئەگەر**

دوبارە ئەویشت گەڕاندەوە ئەوا لەو بە هۆی ئەو شتەوە کە بەندە چاکەکارەکانت پێ‌دەپارێزێ بیپارێزە)). و دەفەرمووێت: ((بسمك اللـهم أمـوات و أحيـا)) واتە: ((پەروەردگارا! بە ناوی تۆ دەمرم و زیندوو دەبمەوە)).

# بەخیلی لە نەخۆشیەکانی دڵە

بەخیلی: یەعنی کینە بەرامبەر بە کەسێك و حەز کردن بە لە ناو چوونی ئەو نعیمەت و دەستکەوتانەی کە دەستی کەوتوون. هەندێك ووتویانە بەخیلی هەر بەو زەحمەتە و ڕنجە دەوترێت کە کەسێك لەکاتی بەخەبەر بوون لە حاڵی کەسێك کە گوزەرانی باشی بووە. هەروەها وتوویانە: بەخیلی یەعنی ئارەزووی لە ناو چوونی نیعمەت لە خەڵکانی تر بێ ئەوەی ئەو نیعمەتە بۆ خۆی ئارەزوو بکات. بە پێچەوانەی بەخیلی چاکە، کە بریتیە لە ئارەزوو کردنی نیعمەت بۆ خۆت بێ ئەوەی ئارەزووی بە لەناو چوونی ئەو نیعمەتە بیت لە خەڵکانیتر. کەواتە بەخیلی هەر ئەو بوغز و ڕەنج و ڕق لێ بوونەیە کە بەینی چاکی حاڵ و گوزەرانی کەسێك کە چاوی تێبڕاوە بە کەسێك کە چاوی بڕیوەتە ئەو تێك دەدات.

# جۆرەکانی بەخیلی

١ ناڕەحەتی و ڕەنجە ڕۆ بوون بە هۆی نیعمەتێك کە دراوە بە یەکێك ئەم بەخیلیەیە خراپ و ناپەسەندە. لەم حاڵەتەدا کەسی بەخیل ڕقی لە کەسێك دەبێت کە بەخیلی پێدەبات و هەروەها بە بینینی ئەو تووشی ناڕەحەتی دەبێت و ئازاری پێدەگات و ئەمە بە شێوەی نەخۆشی لە دڵیدا دەمێنێتەوە و ئەگەر ببینێت کە ئەو نیعمەتە لەو کەسە گیراوەتەوە ئەوا پێی خۆش دەبێت. هەرچەندە کە بۆ ئەو لە ڕووی مادديەوە سوودێکی نەبێت. هەر ئەمە بۆ ئەو بەسە کە دڵی سوکنایی بێت و ئیتر هەست بە ئازار و ناڕەحەتی نەکات. هەڵبەتە دەبێ بزانرێت کە ئەم ئازار و ئێشە بۆ هەمیشەیی لەناو ناچێت بەڵکو وەکو نەخۆشیە کە ئێشەکەی بە چارەسەرکردنی بۆ ماوەیەك دادەمرکێت و نەخۆشیەکەی هەر ماوەتەوە. لەبەر ئەوە ئەم بوغزە و ناڕەحەتیەی ئەو بەرامبەر بە نیعمەت و بەخششەکانی خوا بە بەندەکانی جۆرێکە لە نەخۆشی و لەوانەیە دوبارە بەرامبەر بە کەسێکیتر بگەڕێتەوە. و ئەمە کۆتایی چارەڕەشی و زیانکارییە.

٢ کەسی بەخیل گەورەی کەسێك کە بەخیلی پێدەبات لەسەر خۆی بە ناپەسەندی دەزانێت و حەز دەکات بێئەوەی شتێك لە

کەسێك کە بەخیلی پێدەبات (بەخ لێکراو) کەم ببێتەوە ئەویش وەکو ئەو کەسە بێت یان گەورەتر بێت لەو. ئەمەش جۆرێکە لە بەخیلی و هەروەها پێشی دەوترێ بەخیلی بە چاکە.

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان حەزرەتی محەمەد (ﷺ) لە فەرموودەیەك کە (متفق علیە) کە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود و عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەحمەتی خوایان لەسەر) ڕاوی بووە ئەوی بە بەخیلی ناو بردووە: ((لاحسد الا فی اثنتین رجل اتاه الله الحکمة فهو یقضی بها ویعلمها و رجل اتاه الله مالا وسلطه علی هلکه فی الحق)) واتە: ((بەخیلی جگە لەم دوو شتە ڕەوا (شەرعی) نیە: پیاوێك کە خوا زانست و حیکمەتی پێبەخشیوە و بەو دادوەری دەکات و زانست و زانیاری فێری خەڵکی دەکات. کەسێك کە خوا ماڵ و سامانێکی پێبەخشیوە و ئەوی موسەیتەر کردوە بەسەریدا تا ئەو ماڵ و سامانە لە ڕێ حەقدا سەرف بکات)).

گێڕانەوەی عەبدڵلای کوڕی عومەر (ڕەحمەتی خوای لەسەر) بەم شێوەیە: ((لاحسد الا فی اثنتین رجل اتاه الله القران فهو یقوم به اناء اللیل و النهار و رجل اتاه الله مالا فهو ینفق منه فی الحق اناء اللیل و النهار)). واتە: ((بەخیلی جگە لەم دووشتەدا ڕەوا (شەرعی) نیە. پیاوێك کە خوا قورئانی پێ بەخشیوە و بە ڕۆژ خەریکی خوێندن و کارکردنە بەو. پیاوێك کە خوا ماڵ و سامانێکی پێداوە و ئەویش شەو ڕۆژ خەریکی بەخشینیەتی لەڕێ خوادا)).

كەواتە ئەم جۆرە بەخیلیە كە لەودا لەناو چوونی نیعمەتیٚ لە یەكێكیتر داوا نەكات، بەڵكو ئەویشی بۆ خۆی ئارەزوو بكات كێشەی تێدا نیە. ئیمامی بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە[٤] كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لاحسد الا فی اثنتین رجل اتاه الله القران فهو یقوم به اناء اللیل و النهار فسمعه رجال فقال: یالیتنی اوتیت مثل ما اتی هذا فعملت فیه مثل ما یعمل هذا و رجل اتاه الله مالا یهلكه فی الحق فقال رجل: یالیتنی اوتیت مثل ما اوتي هذا فعملت فیه مثل ما یعمل هذا)). واتە: ((بەخیلی جگە لەم دووشتە ڕەوا نیە: یەكێك لە بارەی پیاوێك كە خوا قورئانی پێداوە و ئەو شەو ڕۆژ خەریكی خوێندنەوەی بێت. هەروەك كەسێكی تر گویٚ لە خوێندنی قورئانی ئەو بێت دەڵێن: خوایا! خۆزگە وەك و ئەو شتەی كە بەو پیاوەت بەخشیوە بە منیشت بخشی با، تا منیش وەكو ئەو قورئانم بخوێندایەتەوە. و پیاوێك كە خوا ماڵ و سامانێكی پیٚبەخشیوە و ئەو لە ڕێگەی حەق و ڕاستیدا سەرفی دەكات. كەسێكیتر دەڵێت: خوایا! خۆزگە وەكو ئەو شتەی كە بەو پیاوەت بەخشیوە بە منیشت بەخشی با، تا منیش وەكو ئەو كار و كردارم ئەنجام بدایە)).

[٤]_ ابو هریرە، عبدالرحمن كوڕی دوس یمانەیە كە چەندان فەرموودەی زۆر لە پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبوبەكر و عومەر (ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لەسەر) گێڕاوەتەوە سەعیدی كوڕی میب و بەشیری كوڕی نهیك یشی لە ابوهریرە فەرموودەی زۆریان گێڕاوەتەوە. ئەو لە هەموو هاوەڵە بەڕێزەكان فەرموودەی زۆرتری گێڕاوەتەوە و لە ساڵی ٥٨ هـ.ق دا ماڵئاوایی كرد.

کەواتــە پێغەمبــەری خۆشەویــست (ﷺ) بــەخیلی تــەنها لــەم دووشتەدا بە ڕەوا (شەرعی) داناوە. و زانایان ئەم جۆرە بەخیلی بە چاکە (غبطە) ناوی دەبەن. کە بریتیە لە داوا کردنی نیعمەتێك کە خوا بە یەکێکیتری داوە بێئەوەی ئارەزووی لەناو چوونی نیعمەتی ئەو کەسە بکات.

لێرەدا ئەگەر پرسیار بکرێت بۆچی بە (غبطە) بەخیلی بە چاکە دەوترێت بەخیلی لە حاڵێکدا کە مرۆڤ حەز دەکات خوا نیعمەتێکی زۆری پێبدات؟ لە وەڵامدا دەبێ بوترێت خاڵی دەست پێکردنی ئەم حەزلێکردنە بەهۆی بینین و کاریگەری ئەو نیعمەتە بووە لە سەر کەسێك کە لە بینینیدا هەستی بە ئێش و ئازار کردووە. و ئەگەر ئەو نیعمەتەی جگە لە غەیری خۆی نەبینیایە ئەوا هیچ کات هەستی بە پێویستی ئەو نەدەکرد، کەواتە کاتێك کە سەرچاوەی ئەم هەستە و ئەم حەزو ئارەزووە بەم شێوە بووە، ئەوا بۆ ئەو ناوێك جگە لە بەخیلی ناتوانێت ببێت. بەڵام ئەگەر کەسێك حەزی کردبێت کە خوا بێئەوەی درگای ڕەحمەتی لەسەر ئەویتر ببەستێت و نیعمەتی لەو بگرێتەوە، و بەویش نیعمەت ببەخشێت ئەوا بەمە ناوترێت بەخیلی. بەڵکو هەستی پێویستی بە نیعمەتێك کە ئەوی لە خوای خۆی داوا کردووە و زۆرێك لە خەڵکی بە جۆری دووەم لە بەخیلی، بە جۆرێك لە تاقیکردنەوە و ئازمایش ناو دەبەن. هەروەها خوایش دەیەوێت کە مرۆڤ جۆری دووەمی

بەخیلی هەبێت نەك جۆری خراپ و ناپەسەندی یەکەم. شایانی وەبیرهێنانەوەیە کە ئەمە بەجۆرێك لە (ڕکەبەری پێشبەڕکێ کردن لە بەدەست هێنانی خێرو چاکە)ش دەوترێت. کە لەودا دووکەس بۆ گەیشتن بە خێر و چاکە ڕکەبەری دەکەن و هەر دووکیان قەسدی سەرکەوتنیانە و دەیانەوێت کە لە درگای خوا نزیکتر ببنەوە.

پێشبڕکێ و ڕکەبەری لە ڕێگەی شەرعیەوە گرفتی نیە بەڵکو پاداشتی ڕێزیشی دەگیرێ. هەروەك خوا دەفەرموێت: ﴿ان الابرار لفی نعیم * علی الارائك ینظرون * تعرف فی وجوههم نضرة النعیم * یسقون من رحیق مختوم * ختامة مسك * وفی ذلك فلیتنافس المتنافسون﴾ (المطففین. ٢٢_٢٦) واتە: (بێگومان چاکەکاران لە نێوان جۆرەها نیعمەت و خۆشیە بێ کۆتاکانی بەهەشت دەبن، لەسەر کورسیە گەورە و بە شەکۆکان پاڵ دەدەنەوە _ و لە جوانیەکانی و نیعمەتە زۆرەکانی ئەوێ ورد دەبنەوە _ خۆش و سەر سەوزی و چالاکی نیعمەت لە سیمایاندا دەخوێنرێتەوە و بەوان شەرابێکی پاك و بێگەرد دەدرێت کە نە دەستی لێدراوە و نە سەری بەستراوە، خۆشی و سەری ئەوان لە میسکە. پێشبڕکێ کەران دەبێ بۆ بەدەست هێنانی ئەم _ جۆرە شەرابە و نیعمەتەکانیتری بەهەست _ لەگەڵ یەکتردا پێشبڕکێ و ڕکەبەری بکەن و پێشی یەکتر بکەون). لەم ئایەتەدا خوا بە پێشبڕکێ کەران و سوبقەت گرەکان دەفەرمووێت بۆ بەدەست هێنان و گەیشتن بە

نیعمەتە دایمەکانی بەهەشت لەگەڵ یەکدا پێشبڕکێ بکەن نەك بۆ بەدەست هێنانی دنیای بڕاوە و لە ناو چوو. و ئەم چەمکە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) یەکدەگرێتەوە کە تێدا لە بەخیلی بردن نەهی کردووە مەگەر لە دووشتدا: یەکێ ئەوە کە خوا زانستی بە کەسێك بەخشیوە و ئەو کەسە بە زانستی خۆی عەمەل دەکات و ئەو زانستەش فێری خەڵکی دەکات. دووەم ئەوە کە خوا ماڵ و سامانێکی بە کەسێك بەخشیوە و ئەو کەسەش ئەو ماڵە لە ڕێی خوا دەبەخشێت، بەڵام کەسێك کە زانستی پێبەخشراوە کە نە عەمەلی پێدەکات و نە خەڵکیتریش فێر دەکات یان ماڵێکی پێدراوە و لەڕێی خوا نایبەخشێت، نرخ و بەهای بەخیلی نیە و نابێت ئارەزووی گەیشتنی بەوە هەبێت لەبەر ئەوە گەیشتنی بەوە خێرێکی نیە جگە لە سزا و بەدبەختی. هەروەها سەرپەرشتی و بەرپرسیارەتیەك بە کەسێك دەسپێردرێت و ئەویش بە دادپەروەری و زاناییەوە لە بەرامبەر ئەوەوە هەوڵ دەدات و ئامانەت دەگەیێنێتەوە دەستی خاوەنی و حەق و بەرپرسیارەتیەکە بەو شێوە کە هەیە ئەنجام دەدات و لە نێوان خەڵکیدا بە کتێبی قورئان و فەرموودە بڕیار دەدات ئەوا پلەیەکی بەرزی هەیە. وێنەی ئەو وەکو موجاهیدێکە کە لە جیهادێکی گەورەدا بێت. چونکە نەفسی بەشەری بەو شێوەیە دروست کراوە کە سەبارەت بە کەسانێك کە لە ئازار و نارەحەتیەکی زۆردان بەخیلی نابات. هەر لەسەر ئەمەیە

کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) باسی موجاهیدی لە ڕێگەی خوادا لە فەرموودەکانی بەخیلی نەهێناوە لەبەر ئەوە کەسی موجاهید لە وەها ناڕەحەتی و ئازارێکدایە کە گەورەی و پاداشتی زیاترە سەبارەت بە کەسێك کە ماڵی لە ڕێی خوادا دەبەخشێت و یان زانستەکەی فێری خەڵکی دەکات چونکە ئەم دوو تاقمە دوژمنیان نیە کە فشار بخاتە سەریان و تووشی ئازار و ناڕەحەتی ببن. و ئەگەر ئەوانیش لە ڕێی بلاوکردنەوەی ماڵ و زانستیان دوژمنیان بۆ پەیدا ببێت ئەوا خێر و پاداشتی ئەوانیش زیاد دەکات. هەر وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی کەسی نوێژکەر و ڕۆژووگر و حەج کەردا لە فەرموودەکانی بەخیلی ناوی نەهێناون لەبەر ئەوە ئەم جۆرە کردارە گەورانە لە ڕووی کۆمەلایەتی بۆ مرۆڤ بەقەدەر بەخشین و فێرکردنی زانست سوودیان نیە بەخیلی بردن زیاتر سەبارەت بە پۆست و پلەو پایەو کورسی ڕوو دەدات نەك بە هۆی خواردن و خواردنەوە و پۆشاکەوە لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەخیلی سەبارەت بە خاوەن ماڵ و سامان و زانست بە شەرعی دانا بە مەرجێك بە شێوەی (غبطە) بەخیلی بە چاکە بێت. چونکە ئەم دوو کەسە هەمیشە لە نێوان خەڵکیدا ڕێز و حورمەتی زۆریان هەیە. و بەردەوام گرووپێکی پەراوێز خراو لە خەڵکی بڕاوە و زانا و سەرمایەداران دەبینن. زانا خۆراکی ڕۆح و دەروون بە خەڵکی دەدات و خاوەن ماڵ خوراکی لاشە بە خەڵکی دەدات و لە

هـەر دوو حاڵەکـەدا خـەڵکی پێویـستیان پێیانـە. هـەروەك خـوا دەفەرمووێت: ﴿ضرب الله مثلا عبدا مملوكا لايقدر على شاء ومن رزقنـاه منارزقا حسنا فهو ينفق من سرا و جهر أهـل يـستون الحمـد لله بـل اكـرهم لايعلمون * و ضرب الله مثلا رجلين أحدهما أنكم لا يعدو على شيء وهو كـل على مولاه اينما يوجه لايات بخير انمـا يوجـد هـل يـستوى هـو ومـن يـامر بالبدل وهو على صراط مستقيم﴾ (النمل:٧٥_٧٦) واتە: (خـوای گـەورە بە شێوەی نموونە دەهێنێتەوە کە توانای بەسەر هیچ شتێکدا نیـە و _ لەبەرامبەر ئەوەوە _ مرۆڤیکی باوەڕدار _ بە نموونە دێنێتـەوە کـە ڕۆژێکـی حـەلاڵی پـاکیزەی پێبەخـشراوە و ئـەو بـە شـاراوە و ئاشکرا لـەو ڕۆژەدا دەبەخشێت ئایا ئەوانە وەکو یـەکن. سـوپاس کردنی خوا سزایە _ کە ئێمەی کردۆتە بەندەی خۆی نەك بەنـدەی بەنـدەکانی خـۆی _ و بـەڵکو زۆرێـك لـەوان نـازانن جیـاوازی ڕەوا و ناڕەوا چییە). خوا دوو کەس بە نموونە دێنێتـەوە کە یـەکێك لە وان بـەلاڵی لـە دایـك بـووە و توانـای ئەنجامـدانی هـیچ ئیـشێکی نیـە و بووتـە سـەربار بـۆ خاوەنەکـەی و بـۆ هـەر جێگایـەکی بنێرێـت سوودێکی نیە. ئایا ئەم جۆرە کەسە وەك ئەو جۆرە کەسە وایە _ کرێکـار و نـان پەیداکـەر و هـەمووی خێـر و بەرەکەتـە و بـەردەوام خـەڵکی بۆ دادپـەروەری و یەکسانی بانگهێشت دەکـات و لـە سـەر ڕێگای ڕاست و دروستدایە.

نموونەی یەکەم: خوا لەم نموونەیـەدا زاتـی پـاك و پـیرۆزی خـۆی لەگـەڵ ئـەو شـەریکانە بـەراورد دەکـات کـە خـەڵکی لـە بەندایـەتی

کردنــدا بەندایــەتی بــۆ دەکــەن. شــریکان و بتانێــك کــە هــیچ دەسەڵاتێکیان نیە لەسەر کردەوەی چاك و یان قسانی بە سوود. ئایا کەسێك کە براوەی کەسێکیتر بێت و توانایی نەبێت لەسەر هیچ ئیشێك لەگەڵ کەسێك کە خوا ماڵ و سامانی پێبەخشیوە و ئەویش لەم ماڵ و سامانەی لە ڕێی خوا ببەخشێت وەك یەکن؟! کەواتە خوایەك کە توانای چاکە گەیاندنی هەیە بە بەندەکانی چلۆن وەکو دروستکراوێکی سست و بێ توانایە کە توانای ئەنجامدانی هیچ ئیشێکی نیە؟ چۆن دەتوانرێت کە دروستکراوێك وابکرێتە شەریکی خوا؟ ئەسڵەن شتگەلێکی وا مەحاڵ و باوەڕ پێنەکراوە.

نموونــەی دووەم: دیــسان خــوا لــەم نموونەیــەدا زاتــی پــاك و پــیرۆزی لەگــەڵ ئــەو شــریکانە بــەراورد دەکــات کــە خــەڵکی لــە بەندایــەتی کردنــدا بەندایــەتی بــۆ دەکــەن. شــریکان و بتانێــك کــە ناتوانن قسە بکەن و بیربکەنەوە. ئایا کەسێك کە لاڵە و ناتوانێت بیربکاتەوە و توانای ئەنجامدانی هیچ ئیشێکی نیە و کەوتۆتە سەر شانی خاوەنەکەی و هەر کاتێك کە بینێرن بە دوای ئیشێکدا ناتوانێت ئەنجامی بدات و هیچ سوودێکی نیە. وەك کەسێکە کە زانایە و دادوەر و خەڵکی بەرەو ڕێی ڕاست و دادپەروەری بانگ دەکات و خۆشی لەسەر ڕێی ڕاست توند وەستاوە؟ کەواتە چی دەڵێن کە بەندەیەکی وا لەگەڵ خوایەك کە زانا و دادپەروەرە و بە

توانا لە ئەمر و نەهی و دروستکەری ڕێگای ڕاستە، بکەنە هاوەڵی (شریك). خوا دەفەرموێت: ﴿شهد الله انه لا اله هو والملائكة و اولو العلم قائماً بالقسط لا اله الا هو العزيز الحكيم﴾ (ال عمران: ١٨) واتە: (خوا _ بە پیشاندانی دنیای بوون بە شێوەی تەنها و پەیوەست بوو و نیزامێکی تەنها و بێهاوتا، بە پراکتیکی _ شاهیدی دەدات بەوەی دروست کەرێك جگە لەو نیە و ئەو _ لە ئیشە دروستکراوەکانی خۆی _ دادپەروەری دەکات. و فریشتەکان و زاناکان شاهیدی دەدن کە جگە لەو دروست کەرێك نیە. و ئەو بە توان و بەحیکمەتە). ﴿ان ربی علی صراط مستقیم﴾ (هود: ٦٥) واتە: (بێگومان، خوای من لەسەر ڕێگای ڕاستدایە). نەخێر هەرگیز، خوا لەگەڵ بتان و شریکانی پەست و لاواز و بێ نرخ قابیلی بەراورد نیە. هەر لەبەر ئەم دوو نیعمەتە هاتبوو کە خەڵکی خێزانی عەباسیان (ڕەحمەتی خوای لەسەر) بە گەورە و بەڕێز دانا بوو. لەبەر ئەوە لەو خێزانەدا عەبدوڵلا ی کوڕی عەباس (ڕحمەتی خوایان لەسەر) هەبوو کە قورئان و فەرموودەی فێری خەڵکی دەکرد و برایەکی تری خواردنی بە خەڵکی دەدا. بۆیە خەڵکیش ئەوانیان خۆشدەویست.

هەروەها کاتێ کە معاویە (ڕەحمەتی خوای لەسەر) خەڵکی دەدی کە ئەحکام و مەناسیکی (مناسك) حەجی خۆیان لە هاوەڵی بەڕێز: عەبدوڵلا ی کوڕی عومەر (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەپرسین

و ئەویش وەڵامی دەدانەوە، ووتی: سوێند بە .خوا ئەمە شەرەفێکی گەورەیە کە خوا بە عەبدوڵلا ی بەخشیوە. گێڕدراوەتەوە کە ئیمامی عومەر و ئیمامی ئەبوبەکر (ڕەحمەتی خوایان لەسەر) هاتووە دەڵێت: ((امرنا رسول الله(ﷺ) ان نتصدق فوافق ذلك مالا عندی فقلت: اليوم اسبق ابابكر ان سبقتة يوما، قال فجئت بتصف مالی، قال فقال لی رسول الله(ﷺ) ما ابقيت لاهلك؟ قلت: مثله، واتى ابوبكر رضى الله عنه بكل ماعنده، فقال له رسول الله (ﷺ) ماابقيت لاهلك؟ قال: ابقيت لهم الله و رسوله، فقلت: لا اسابقك الى شیء ابدا) واتە: ((پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ئەمری کرد پێمان کە بۆ جیهاد کردن لە ڕێی خوادا ماڵ و سامان بهێنین. منیش ماڵ و سامانێکم هەبوو و بە خۆمم ووت: ئەگەر بۆ ڕۆژێکیش بووە لە ئەبوبەکر (ڕەحمەتی خوای لەسەر) پێش بکەوم، ئەمڕۆ دەکەومە پێش. بۆیە نیوەی ماڵێک کە هەم بوو بردمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: شتیکت بۆ خێزانەکەت بەجێ هێشتووە؟ ووتم: نیوەی ماڵەکەم بۆ ئەوان داناوە. لەو کاتەدا ئەبوبەکر (ڕەحمەتی خوای لەسەر) هەموو ماڵەکەی هێنا. پێغەمبەر (ﷺ) پێ فەرموو: شتێکت بۆ خێزانەکەت بەجێ هێشتووە؟ ووتی: خوا و پێغەمبەرەکەیم (ﷺ) بۆ ئەوان بەجێهێشتووە. ووتم: ئەی ئەبوبەکر! ناتوانم هیچ کات لە ئەنجامدانی شتێکدا پێشت بکەوم)). ئەوەی کە عومەر (ڕەحمەتی خوای لەسەر) ئەنجامیدا جۆرێ

پێشبڕکێ بوو لە کاری خێر و بەخیلی بەچاکە ڕاست بوو. وەلێ ئەبوبەکر (ڕەحمەتی خوای لەسەر) هەمیشە گەورەیی هەبوو سەبارەت بە عومەر (ڕەحمەتی خوای لەسەر) و ئەو پێویستی بە (غبطە) بەخیلی بەچاکە نەبوو لەم ڕووەوە هیچ کات بە حال و وەزعی کەسێك بەخیلی نەدەبرد.

پێغەمبەری خوا موسا (سەلامی خوای لەسەر) لەکاتی بەرز بوونەوەدا (میحراب) دایە حاڵی کۆتایی پێغەمبەران (خاتم)، بەخیلی بە چاکەی کرد. تا ئەو شوێنەی کە بەو شێوە گێڕدراوەتەو: ((بکی لما تجاوزة النبی (ﷺ) فقیل له : مایبکیل؟ فقال: ابکی لان غلاما بعث بعدی یدخل الجنة من امنة اکثر ممن یدخلها من امتی)) واتە: ((کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) لە تەنیشت موسا وە (سەلامی خوای لەسەر) تێپەڕی موسا (سەلامی خوای لەسەر) گریا. وتیان: بۆچی دەگریت؟ وتی: لەبەر نەوجەوانێك دوای من بووە بە پێغەمبەر (ﷺ) ژمارەی کەسانێك کە لە ئومەتی ئەو دەچنە ناو بەهەشت لە ژمارەی کەسانی ناو ئومەتی من کە دەچنە ناو بەهەشت زیاترن)). بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

لە نێوان هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) کەسانی تریش وەك ابو عبیدەی جراح (ڕەحمەتی خوای لەسەر) و نموونەی وەك ئەو هەبوون. کە تەنانەت لەم جۆرە بەخیلی کە نەکردنی باشترە واتە بەخیلی چاکە دوور دەکەوتنەوە چونکە پلە و پایەی ئەوان

گەورەتر و بەرزتر بوو لەوەی کە بە کەسێکیتر بەخیلی ببەن و هەر لەبەر ئەمەیە کە ابو عبیدە (رحمەتی خوای لەسەر) شایستەیی ئەمانەتداری ئومەتی بە دەست هێنا لەلایەن پێغەمبەروە (ﷺ) و هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی بە ئەمینداری ئومەت ناو دەبرد.

کەواتە کەسێکی ئەمیندار کە لە خۆیدا هیچ جۆرە ترس و هەستێك بەرامبەر بە کەم و کوڕی ئەمانەتی نەبێت لەگەڵ کەسێك کە لە خۆیدا هەست بە کەم و کوڕی لە ئەمانەتدا دەکات لە پێشترە.

لە فەرمودەیەکدا کە ئیمامی احمد بن حنبل گێڕاوەیەتیەوە انس بن مالك (ڕەحمەتی خوایان لەسەر) دەڵێت: ((کنا یوما جلوسا عند رسول الله(ﷺ) فقال: یطلع علیکم الان من هذا الفج رجل من اهل الجنة قال فطلع رجل من الانصار ینطف لحیتة من وضوء، قد علق نعلیة فی یدة الشمال فسلم. فلما کان الغد قال النبی (ﷺ) مثل ذلك، فطلع ذلك الرجل علی مثل حالە، فلما کان الیوم الثالث قال النبی (ﷺ) مثل ذلك، فطلع ذلك الرجل علی مثل حالە)) واتە: ((ڕۆژێك لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبووین. فەرمووی: ئێستا لێرەوە پیاوێك دێت کە لە ئەهلی بەهەشتە. لەناکاودا پیاوێك لە پشتیوانان (انصار) هات. لە حاڵێکدا هێشتا ڕیشی خۆی ووشك دەکردەوە کە دەست نوێژی گرتبوو و پێڵاوەکانی بە دەستی چەپی هەڵگرتبوو و هاتە پێشەوە و سەلامی کرد. بۆ سبەینێ دوبارە پێغەمبەر (ﷺ) هەمان قسەی دوێنێی دوبارە کردەوە و لە ناکاو هەمان پیاو و بەهەمان حاڵی

دوێنێوە هات. ڕۆژی سێیەمیش پێغەمبەر (ﷺ) هەمان قسەی ڕۆژی پێشووی دوبارە کردەوە و دیسانەوە هەمان پیاو بە هەمان حاڵی پێشووە هات. کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) هەستاوە ڕۆیشت. عەبدوڵلای کوڕی عاص (ڕەحمەتی خوای لەسەر) کەوتە شوێن ئەو پیاوە، دوای بەم شێوەیە باسی کرد: ((چوومە لای ئەو پیاوە ووتم: من لەگەڵ باوکمدا تووشی ناخۆشی بووم و سوێندم خواردووە کە تا سێ ڕۆژ نەچمەوە لای. ئەگەر یارمەتیم بدەیت دەمەوێ بێمە ماڵی ئێوە. ئەو پیاوە یارمەتی دام و تا سێ شەو ڕۆژ لە ماڵی ئەودا بووم. لەم ماوەیەدا کردەوەیەکی تایبەتم لێ بەدی نەکرد تەنها ئەو شەوانە کاتێ جلەکانی لادەبرد زیکر و یادی خوای دەکرد و تکبیری دەکرد و تاهاتنی نوێژی بەیانی دەخەوت. عەبدوڵلا دەڵێت: لەو پیاوە جگە شوکر و سپاسی خوا هیچیترم نەبیست. کاتێك ویستم بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە بەوم ووت: ئەی بەندەی خوا! من لەگەڵ باوکمدا هیچ کێشەیەکم نیە. بەڵکو سێ جار لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست کە فەرمووی: ((ئێستا لێرەوە پیاوێك دێت کە لە ئەهلی بەهەشتە))، و هەر سێ جارەکە تۆ لەو ڕێگایەوە هاتیت. ویستم چەند ڕۆژێك لەگەڵ تۆدابم تا بزانم چ کردەوەیەك ئەنجام ئەدەیت کە بووی بە بەهەشتی تا منیش بەو شێوەیە کاربکەم. وەلێ تۆم نەبینی کە کردارێکی زیاتر ئەنجام بدەیت. کەواتە: چ شتێك بوویە هۆی ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەرامبەر

تۆوە بڵێت بەهەشتیت؟ ئەو پیاوە ووتی: من کردەوەیەکی تایبەت ئەنجام نادەم کە بوو بێتە هۆی بەهەشتی بوونم. تەنها دەزانم کە ڕەق و کینە و بوغزی هیچ موسڵمانێکم لە دڵدا نیە و سەبارەت بە خێر و پاداشتێك کە خوا بە کەسێکی بەخشیوە، بەخیلی نابەم. عەبدوڵلا ووتی: کەواتە هەر ئەمە ئەو شتەبوو کە تۆی گەیاندوەتە ئەم پلەو پایەیە و هەموو کەسێك توانایی ئەوەی نیە. مەبەستی عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەحمەتی خوای لەسەر) ئەمە بوو کە هەر چەند بە ڕووکەش (ظاهراً) ئەم کردارە سادە و ئاسان دێتە بەرچاو بەڵام زۆرێك لە خەڵکی بەوەوە گرفتارن. هەر لەبەر ئەمەیە کە خوا سپاس و ستایشی _ پشتیوانان دەکات و لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ولا يجدون في صدورهم حاجة مما أوتوا و يؤثرون على أنفسهم لوكان بهم خصاصته﴾ (الحشر: ٩) واتە: (و لە دەروونی خۆیاندا، هەست و حەز و ئارەزوو کە پێویستی ناکەن بە شتگەلێك کە بە کۆچکەران (مهاجر) دراوە و ئەمان لەسەر خۆیان بەڕێزتر دەدەن هەرچەند کە خۆیان زۆر پێویستیان بێت)).

موفەسیران دەڵێن: پشتیوانان لە دڵەکانیاندا هیچ جۆرە هەستێکی بەخیلی بەچاکەیان نەبوو بەرامبەر بەوەی کە لە ماڵ بە کۆچکەران دەدرا. تەنانەت ماڵ و سامانی خۆشیان لەگەڵ کۆچکەراندا دابەش دەکرد. لەگەل ئەوەشدا لە نێوان ئەوس و خەزرەجدا کە دوو هۆز بوون لە مەدینەدا بەخیلی بەچاکەیان

دەبرد. هەروەك لە دینداریدا لەگەل یەك پێشبڕكێیان دەكرد و ئەگەر یەك لەوان بیبینیایە كە لایەنی بەرامبەر كردارێكی ئەنجام بدایە كە بەهۆیەوە لەلای خوا و پێغەمبەر (ﷺ) گەورەتر و بەڕێزتر دەبوو. ئەویش یەكسەر بە ئەنجامدانی ئەو كردارە هەڵدەستا تا لەم گەورەیی و بەڕێزیە بێبەش نەبێت. هەڵبەت ئەم بابەتە ڕكەبەرێك بوو بۆ گەیشتن و نزیك بوونەوە لە خوای گەورە نەوەك جۆرێك لە ڕەق و بوغز بەرامبەر بە یەكتر و بەخیلی بەچاكە بوو بۆ گەیشتن بە كەماڵ و ڕێ بڕینی ڕێگای بەختەوەری و سەربەرزی نەوەك بوون بە خاوەن ماڵ و سامان و پلەوپایە و دەسەڵاتی دنیایی. خۆزگە دەخوازم بە دڵێكی وا خۆزگە دەخوازم بە خاوەن دڵێكی وا چونكە خوا دەفەرموێت: ﴿وفی ذلك فلیتنافس المتنافسون﴾ (المطففین: ٢٦) واتە: (پێشبڕكێ كەران دەبێ بۆ بەدەست هێنانی _ شەرابێكیوا و نیعمەتەكانی تری بەهەشت _ لەگەڵ یەكتر پێشبڕكێ بكەن و پێش یەكتر بكەون).

بەلام ئەو بەخیلیەی كە ناپەسەند و خراپە خوا بە حەرامی داناوە. هەروەك لە بارەی بەخیلی جوولەكەوە دەفەرمووێت: ﴿ود كثر من اهل الكتاب لو یردونكم من بعد ایمانكم كفارا حسدا من عند انفسهم من بعد ما تبین لهم الحق﴾ (البقرة: ١٠٩) واتە: (زۆرێك لە ئەهلی كتێب بە هۆی بەخیلیەك كە لە دەروونیاندا ڕەگی داكوتاوە، حەز و ئارەزوو دەكەن ئەگەر ببێت _ ئێوە بەرەو كوفر و حاڵی

پێشوو کە هەتانبووە _ بگەڕێننەوە، دوای ئەوەی کە باوەڕتان هێناوە، لەگەڵ ئەمەشدا ڕاستی ئیسلام بۆ ئەمانە ڕوون بووەتەوە).

جوولەکەکان مورتەد بوون و گەڕانەوە لە ئیسلام لە ڕووی بەخیلی و ڕقێك کە هەیان بوو ئارەزوویان دەکرد بۆ موسڵمان. لەبەر ئەوەی ئەوان لەم نیعمەتە گەورەییە کە موسڵمانانی گرتۆتەوە. زۆر پێیان ناخۆش بوو و هەستیان بە ڕەق و بوغز دەکرد. خوا لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿أم يحسدون الناس على ما اتاهم الله من فضله فقد آتينا آل إبراهيم الكتاب و الحكمة و اتيناهم ملكاً عظيما * فمنهم من آمن به ومنهم من صد عنه و كفى بجهنم سعيراً﴾ (النساء: ٥٤_٥٥) واتە: (ئایا ئەوانە بەخیلی بەشتێك دەبەن کە خوا لە ڕووی گەورەیی و ڕحمەتی خۆی _ بەهەڵبژاردنی موحەمەد (ﷺ) _ بەخەڵکی _ عەرەبی داوە. ئێمە کە بە ئەهلی ئیبراهیم _ ئیبراهیمێك _ کە لە باو و باپیرانی ئێوە و ئەوانە _ کتێبی ئاسمانی باوەڕیان هێناو کۆمەڵێکیتر، لەو، پشت هەڵدەکەن _ و خەڵکانی تریشیان خەستەبەر گەمە و گاڵتە و ئاگری سوتێنەری جەهەننەم بۆ کەسانێکی وا بەسە). هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قل أعوذ برب الفلق * من شر ماخلق * ومن شر غاسق اذا وقب * ومن شر النفاثات فى العقد * ومن شر حاسد اذا حسد﴾ الحسد: ١- ٥) واتە: (بڵێ بە پەروەردگاری ڕوناکی هێنەر پەنا دەگرم لە شەڕی ئەو شتەی کە خوا دروستی کردووە و لە شەڕی دروستکراوەکانی

و پەنا دەگرم بە خوا لە تاریکی شەو کە ڕوناکی ڕۆژ دەشارێتەوە _ و لە شەڕی کەسانێك کە فوو دەکەن بە گرێ جادویەکاندا _ و لە شەڕی چاو پیسەکان کە ئێرەیی دەبەن).

موفەسیران دەڵێن: ئەم سورەتە بە هۆی بەخیلی جوولەکەو جادوویەك کە لبید بن اعصم لە بەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ) کردی هاتە خوارەوە. کەواتە ئەگەر کەسی بەخیلی لەسەر بنەمایی چاو پیسی و بەخیلی خۆی عەمەل بکات ئەوا بەستەمکار و تجاوەزکار دەژمێردرێت. لە ئەنجامدا دەکەوێتە بەر سزای پەروەردگار. لەم ڕووەوە دەبێ لە بەخیلی دەست هەڵنگرێ و بگەڕێتەوە. بەلاّم کەسێك کە کەوتبێتە بەر چاو و بەخیلی پێبرا بێت ئەوا ستەم لێکراو دەبێ لە بەرامبەر ئێش و ئازاری بەخیلیکە ئارام بگرێت و لە شەڕی پەنا بو خوا ببات تا باوەڕی ساغ و پتەو بێت. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ودكثر من اهل الكتاب لو يردونكم من بعد ايمانكم كفّارا حسدا من عند ماتبين لهم الحق فاعقوا و اصفحوا حتى ياتى الله بامره﴾ (البقرة: ١٠٩) واتە: (زۆرێك لە ئەهلی کیتاب لە ڕووی بەخیلی یەك کە لە وجودیاندا ڕەگ داکوتاوە حەزوو ئارەزوو دەکەن ئەگەر بێت ئێوە بەرەو کوفر وحاڵی پێشوو کە هەتان بووە بگەڕێنەوە دوای ئەوەی کە باوڕتان هێناوە لەگەڵ ئەمەشدا ڕاستی ئیسلام بۆئەمانە زۆر ڕوونە کەواتە ئێوە چاوپۆشی و لێبوردە بن تا ئەوەی کە خوا فەرمان بدات کە لە بەرامبەریاندا چ بکەن).

خوا یوسفی خستە تاقیکردنەوەوە بەهۆی بەخیلیەك کەبراکانی خۆی هەیان بوو بەرامبەری.هەروەك براکان وتیان: ﴿ليوسف و أخوه أحب الى أبينا ونحن عصبة ان أبانا لفى ضلال مبين﴾ يوسف: ٨) واتە: (یوسف و براکەی _ بنیامین کە لە دایکێك بوون _ لەلای باوکمان لە ئێمە خۆشەویسترن لە حاڵێکدا کە ئێمە گروپێکی بەهێزین _ و لەو دوو برایە بۆ باوکمان بەسودترین _ بە دڵنیایەوە باوکمان لە گومڕایی و هەڵەیەکی ئاشکرادایە). ئەوان سەبارەت بە جێگاو پایەیەك کە یوسف و براکەی بنیامین هەیان بوو لەلای باوکیان، بەخیلیان دەبرد. لەبەر ئەمە یعقوب (سەلامی خوای لەسەر) بە یوسفی فەرموو: ﴿لاتقصص رؤياك على اخوتك فيكيدوا لك كيدا ان شيطان للانسان عدو مبين﴾ (یوسف: ٥) واتە: (خەوی خۆت بۆ براکانت مەگێڕەوە _ چونکە دەبێتە هۆی بەخیلیان و شەیتان ئەمانە دەخاتە سەر ئەوەی کە _ بۆ تۆ فێڵ و تەڵەکە بازی دەکەن. بێگومان شەیتان دوژمنی ئاشکرای مرۆڤە).

لەبەر ئەوەی ئەوان بە قسەکردن لەسەر کوشتنی یوسف و خستنە ناو چاڵەوە و فرۆشتنی بەناوی کۆیلە بە کەسانێك کە بەسەر زەمینی کوفر دەڕۆیشتن و بوونە هۆی ئەوەی کە یوسف کۆیلەی کوفر بێت و لە حەقی یوسفدا ستەمیان بەڕەوا دانا و ستەمیان لێ کرد. و لەوێدا یوسف بەهۆی ژنێکەوە کە دەی ویست زینای لەگەڵدا بکات کەوتە ژێر تاقیکردنەوەوە و ئەو بۆ نجات

بوونی پەنای بۆ خوا برد و زیندانی لەسەر ئازادی و سزای قیامەت هەڵبژارد. تێبینی دەکەین کە یوسف لەم ڕووداوەشدا بە هۆی ئەو ژنە ستەمکارەوە ستەمی لێکرا. برا بەخیل و چاوپیسەکانیشی بەهۆی بەخیلیەك کە لە دڵیاندا بوو بەرامبەر بە یوسف بە هۆی ئەوەی کە خستیانە ناو چاڵ. پاشان بەناوی کۆیلەیەکی ئەسیرو بێ ئاگا فرۆشتیان و یوسف کە لەو پەڕی مەردایەتی و ئازایەتیدا بوو سەرەنجام ئەویان خستە زیندانەوە. و ئەمە قورسترین تاقیکردنەوە بوو. یوسف لەسەر گەورەترین و قورسترین ئازار و موسیبەتەکان ئارامی گرت، بە هەڵبژاردنێکی تەواو ڕێگای ئارام گرتنی هەڵبژارد و بە تەواویەك کە هەیبوو لەسەر هەموو شتێك ئارامی دەگرت. پێچەوانەی ئارام گرتنی وستانە لەبەرامبەر ئەو ستەمانەی کە بۆ ئەو بە ڕەوایان دەزانی. لەبەر ئەوە لەوێدا هیچ هەڵبژاردنێکی نەبوو و بە تەواوی ناچار بوو. دەبێ بزانرێت کە ئارام گرتن لە ئەنجامی تاوان لە ئارام گرتن لەسەر بەلاو موسیبەت گەورەترە. هەروەك خوا دەفەرموویێت: ﴿**انه من یتق و یصبر فان الله لایضیع أجر المحسنین**﴾ (یوسف: ٩٠) واتە: (بێگومان هەر کەسێك لە خوا بترسێت _ و لەبەرامبەر بەلاو موسیبەت و ڕووداوەکان _ خۆڕاگری بگرێت _ خوا پاداشتی ئەو دەداتەوە _ چونکە خوا چاکەی چاکەکاران بەزایەنابات).

مرۆڤی باوەڕدار دەبێ بەم شێوەیە لەسەر باوەڕەکەی ئارامی هەبێت یەعنی ئەگەر داوایان لێ کرد کە لە ئایینەکەی دەست هەڵگرێ و بێتە کافر ئەگینا دەیخەنە زیندانەوە و یان لەسەر زەوییەکەی دەری دەکەن (شار بەدەری دەکەن) دەبێ لەسەر باوەڕەکەی بمێنێتەوە و ڕێگای دووەم هەڵبژێرێت واتە ڕێگای تەحەمول و ئارام گرتن هەڵبژێرێت و بیگرێتە بەر. و کۆچکردن قەبوول بکات، هەروەك ئەم بابەتە بۆ کۆچکەران سەرەتایی ئیسلامیش هاتە پێش و ئەوان جێهێشتنی نیشتیمانیان لە وازهێنان لە ئایینەکەیان هەڵبژارد و بەردەوام ئازار و ئەزیەت دەدران.

پێغەمبەری گەورەی ئیسلام (ﷺ) بە شێوە جیاوازەکان کەوتە بەر ئازار و ئەشکەنجەوە وەلێ وەستان و ئارام گرتنی گرتەبەر تەنانەت ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) زیاتر لە یوسف (سەلامی خوای لەسەر) ئازار و ئەشکەنجە درا. چونکە داوایان لە یوسف (سەلامی خوای لەسەر) کرد یان زینا بکات یان بڕواتە زیندان وەلێ لە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی (ڕەحمەتی خوایان لەسەر) داواکرا کە لە ئایینەکەیان دەست هەڵگرن ئەگینا دەکوژرێن. تەبعەن زیندانی بوون لە کوشتن ئاسانترە. هەڵبەت دەبێ بزانرێت کە موشریکان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هۆزی بەنی هاشمیان بۆ ماوەیەکی زۆر لە شیوی ئەبی تالب زیندانی و

گـەمارۆی ئـابووری دران و لـە دوای مردنـی ئـەبی تالـب بازنـەی ئەشـکەنجەیان لەسـەر پێغەمبـەر (ﷺ) زیـاتر کـرد. و کاتێـك کـە لـە پەیمانی پشتیوانان لەگەل پێغەمبـەری (ﷺ) لە عەقەبـەی یەکـەم و دووەم ئاگـادار بـوون کەوتنـە خۆیـان بـۆ ئـەوەی لـە کـۆچ کردنـی موسڵمانان بۆ مەدینەی پێش گیری بکەن.

تەنانەت بڕیاریاندا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکوژن. لێرەدا بوو کە هـەر کـە دەی ویـست کـۆچ بکـات بـە شـێوەی شـاراوە کۆچـیان دەکـرد. تـەنها عومـەری کـوڕی خـەتاب (ڕەحمـەتی خـوای لەسـەر) و کەسـانێکی وەکـو ئـەو بـەو پـەڕی ئازایـەتی و قارەمانیەتیـەوە لەبـەر چـاوی هـەموو موشـریکان کۆچـیان کـرد. بـە کـورتی ئەوانـەی کـە توانیـان، کۆچیان کرد و ئەوانیتر کە توانی ئەم کارەیـان نـەبوو لـە مەککەدا مانەوە و بەرەو زیندان ڕاپێچ کران.

بـەڵێ کێـشە و گرفـت و موسـیبەتێك کـە بـەڕەوا دەزانـرا بـۆ باوەڕداران بە هـۆی گـوێ ڕایـەڵی لـە خـوا و پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) بوو. یەعنی ئەوان بە زەوقی خۆیان ئیسلامیان هەڵبژارد و بە هۆی ئیمانەکەیانەوە بوو کەوتنە بەر ئەشکەنجە و ئازار. وەلێ موسیبەتی زینـدانی بـوونی یوسـف بەڵایـەکی ئاسمـانی بـوو کـە یوسـف هـیچ چارەیەکی جگە لەوەی نەبوو. هەروەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێت:
﴿ولقد همت به وهم بهـا لـولا أن رأى برهـان ربـه﴾ (یوسـف: ٢٤) واتـە:
(ژنەکـە _ زلێخـا _ قەسـدی تێکـەڵاوی لەگـەڵ یوسـف کـرد و

یوسفیش قەسدی تێكەڵاوی لەگەڵ زلێخادا كردبوو ئەگەر بەڵگەی خوای نەدیبا).

كەواتە یوسف یش هەمان مەبەست و قەسدی زلێخای كرد بەڵام چونكە بەڵگە و دەلیلی خوای بینی، دەستی هەڵگرت. كەواتە بەم شێوەیە ئارام گرتنی یوسف لە بەرامبەر موسیبەت و چ ئارام گرتنی لە بەرامبەر ستەمێك كە لەلایەن براكانیەوە لێی كرا تا ڕێژەیەكی زۆر ناچاری بوو و ڕووداوێك بوو كە بۆی هاتەپێشەوە. هەروەها خۆش ویستنی لای باوكی بە هەڵبژاردنی یوسف نەبوو كە دواتر بە هۆی ئەوەوە ئەم هەموو موسیبەتە هاتە پێشەوە بۆی.

كەواتە هەڵبژاردنی ڕەنج و بەڵا و موسیبەت لە ڕێگەی ئیسلام و بیروباوەڕ و ڕكەبەری لەگەڵ شیركرا، نیشانەی ئەوجی ئیمان و لوتكەی بەندایەتیە.

كاتێك خوا بە كەسێك كە لە بەرامبەر نەخۆشی و لە دەستدانی ئازیزانی یان بە هۆی لە دەستدانی ماڵ و سامانی ئارام دەگرێت، پاداشتی ئەداتەوە. كەواتە پاداشتی كەسێك كە لە ڕێی ئیمان و بیروباوەڕی، ڕەنج و ئێش و ئازارەكان هەڵبژاردنی خۆی بە گیان و ماڵ بكرێت، چەندە و بە چ شێوەیەك دەبێت؟!

خوا دەفەرموێت: ﴿ذلك بأنهم لايصيبهم ظلما و لانصب ولا مخمصة فة سبيل الله ولا يطئون موطئًا يغيظ الكفار ولا ينالون من عدوٍّ نيلاً إلا كتب لهم به عملٌ صالحٌ إنّ الله لا يضيع أجر المحسنين﴾ (التوبە: ١٢٠)

واتە: (هەروا کە هیچ ماندووی و تینووی و برسیەتێك نابینن لە ڕێی خوا و هەنگاوێك نانێن بۆ پێشەوە کە ببێتە هۆی تووڕەیی موشریکان و دەست نادەن لە دوژمنان _ ولێدان و کوشت و بڕ دوژمنان ئەنجام نادەن و هیچ بەندییك و غەنیمەتێك لەوان ناگرن _ مەگەر بە هۆی ئەم کردارانەوە ئیشێکی چاك بۆ ئەوان دەنوسرێت و بێگومان خوا پاداشتی چاکەکاران وون ناکات). بەخیلی یەکێکە لە نەخۆشیە گرنگەکانی دڵ. نە خۆشیەکی گشتگیر و گوێزراوە کە تەنها ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی تووشی بوون بلاوە کە دەڵێن: هیچ کەسێك لە بەخیلی بردن نیە لەگەڵ ئەم جیاوازیە کە کەسێکی خۆبەزل زان ئەوە ئاشکرا دەکات و کەسێکی بەڕێز و بە حورمەت ئەو دەشارێتەوە. بەحەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لەسەر) ووتیان: ئایا باوەڕدار بەخیلی دەبات؟ ووتی: مەگەر داستانی یوسف (سەلامی خوای لەسەر) و براکانی لەبیرتان کردووە؟ بەخیلی لە دڵی مرۆڤ چەکەرە دەکات تا کاتێك کە بە قۆناغی بەخیلی بردن و عەمەل پێکردنی نەگەیشتبێت ئەوا بە تاوانێك ناژمێردرێت. کەسێك کە لە دڵیدا بەرامبەر بە کەسێکیتر بەخیلی ببات دەبێ بە بەکارهێنانی ئارام گرتن و تەقوا، کاریگەری ئەو لەناو دڵدا لاببات و بۆ خۆیشی بە ناپەسەندی بزانێت.

لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا لەسەر موسڵمانانە کە ڕەگەکانی بەخیلی و بوغز وشك بکەن. و لەگەڵ کەسێکدا کە بەخیلی دەبات

هاوکاری نەکەن. بەڵکو لایەنی کەسێك بگرێت کە بەخیلی پێبراوە. چونکە ئەو بووەتە ستەم لێکراو و دەبێ لەگەڵی هەستی هاو دەردی بنوێنرێت. ئەگەر بەم شێوەیەمان نەکرد حەقی برایانەی ئیسلامیمان ڕەچاو نەکردووە. نابێت لە بیرمان بچێت کە بەخیلی لە نێوان ژناندا لە پیاوان زیاترە. بەتایبەت لە نێوان ژنانێك کە لە ژیانی هاوسەریدا لەگەڵ یەك شەریکن. چونکە هەریەك لەوان دەیەوێت هەرچەند سەرنجی هاوسەرەکەی بۆ خۆی ڕابکێشێت. هەروەها نێوان ئەو کەسانەی کە هاوبەشیان هەیە. بۆیە لە پۆست و پلە و سامان و وڵات بەخیلی ڕوو دەدات. لەبەر ئەوە هەریەك لەوانە دەبێتە خاوەن بەشێکی زۆر تا لەبەشی ئەوانیتر کەم بکرێتەوە. هەروەها بە کەسانێك کە بوونەتە جێگای ڕێز و ئیحترامی خەڵکی بەخیلی دەبرێت. وەکو بەخیلی براکانی یوسف (سەلامی خوای لەسەر) سەبارەت بە خۆی. و بەخیلی قابیل بەرامبەر هابیلی برای. چونکە خوا قوربانیەکەی هابیلی وەرگرت وەڵێ قوربانیەکەی قابیلی وەرنەگرت و قابیل بە هۆی ئیمان و تەقوایەك کە خوا یە هابیلی بەخشیوە بەخیلی پێدەبرد. و هەروەها بەخیلی جولەکە بەرامبەر موسڵمانان هەر لەم بابەتانەیە.

ئاشکرایە کە یەکەمین نافەرمانیەکانی خوا لە سێ شتەوە دەستی پێکرد کە بریتین لە: خۆبەزل زانین (تەکەبور) و هەروەك حەزرەتی ئادەم (سەلامی خوای لەسەر) و خۆ بەزل زانینی شەیتان

و بەخیلی قابیل، بووە هۆی ئەوەی کە ئەوان لە فەرمانی خوا سەرپێچی بکەن.

لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە: ((ثلاث لاینجو منهن احد: الحسد، الظن و الطیرة و ساحدثکم بما یخرج من ذلك اذا حسدت فلا تبغض واذا ظننت فلا تحقق واذا تطیرت فامض))[5] واتە: ((هیچ کەسێك لە سێ شت نەجاتی نابێت _ و بەلایەنی کەمەوە یەکێك لەو سێ شتە لە وجوودی ئینساندا بوونی هەیە _ کە بریتین لە: بەخیلی، گومانی خراپ، فاڵ گرتنەوەی خراپ. ئێستا ڕێگاکانی دژایەتی و ڕەکەبەری ئەوانەتان پێ دەڵێن: ئەگەر بەخیلیتان برد، دوژمنی مەکەن. ئەگەر بەشتێك گومانی خراپتان برد ئەوا مەیکەنە پراکتیکیەوە _ ئەگەر لەبارەی کارێك فاڵێکی خراپت گرتەوە ئەوا بەئەنجامی مەگەیەنن). ئیبن ئەبی دونیا ئەم فەرموودەیەی لە ئەبو هریرە (رحمەتی خوایان لەسەر) گێڕاوەتەوە. لە کتێبی سونەنی (ابن ماجە، ترمەزی نەسائی و ئەبوداود) لە پێغەمبەر (ﷺ) گێردراوەتەوە کە فەرموویەتی: ((دب الیکم داء الامم قبلکم الحسد و البغض وهی الحالقة لا أقول تحلق الشعر ولکن تحلق الدین)). واتە: ((نەخۆشیەکانی ئومەتەکانی پێشوو لەناو ئێوەشدا سەری هەڵداوە کە بریتین لە: بەخیلی و بوغز. ئەمانە تاشێنەر و لە ناو بەرن. ناڵێن

---

[5] هەیسەم لە_ مجمع الزوائد دا دەڵێت: تەبرانی ئەوەی گێڕاوەتەوە و لە سەنەدی ئەودا ئیسماعیل بن قیص انصاری هەیە کە کەسێکی لاوازە (بڵاوکردنەوە)

کە مووەکان دەتاشێت بەڵکو ئەمانە دینی مرۆڤ دەتاشن و لەناوی دەبن)).

پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بەخیلی و بوغزی بە نەخۆشی ناو بردووە هەر بەو شێوەیە کە بەخیلی بە نەخۆشی ناوبردووە فەرموویەتی: ((وأی داء اکبر من البخل)) واتە: ((و چ نەخۆشی یەك لە بەخیلی گەورەترە)). کەواتە دەبێ ئەمانە بە دەرد و نەخۆشی بزانرێت. لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((أعوذبك من منکرات الاخلاق و الاهواء و الادواء))[6] واتە: ((ئەی پەروەردگار! لە ئەخلاق و ئارەزووەکان و نەخۆشیە پیسەکان پەنات پێ دەگرم)). خوا لە بارەی پێغەمبەرەوە دەفەمووێت: ﴿وانك لعلى خلقٍ عظيم﴾ (القلم: ۴) واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ)! تۆ گەورە و بەرێزی و خاوەنی ئەخلاقی بەرز و جوانیت). کوڕی عەباس (ڕەحمەتی خوای لەسەر) و ئیبن عینە[7] و ئەحمەد بن حنبل دەفەرموون کە ((خلقٍ عظيم)) بە مانایی ئایینی گەورە و بەرز دێت. لە گێڕانەوەیەکیتر لە ئیبن عباس (ڕەحمەتی خوای لەسەر) هاتووە کە ((خلقٍ عظيم)) بە مانای ئایینی پیرۆزی ئیسلام دێت. عایشە

---

۶- گێڕانەوەی ترمزی (۲۵۰) و ئەحمەد (۱/۱۶۷-۱۶۷) و طیالس (۱۹۳) و بیهقی لە سنن دا (۱۰/۲۳۲) و شعب الایمان (۸۷۴۷).

۷ ئەو، سفیان بن عیینە بن ابی عمران میمون الهلالی ابو محمد کوفی یەك چاوی بوو ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لەسەر)، ابنی معین، ابن راهویە و فلاس فەرموودەی زۆریان ل وەرگرتووە. و لە ساڵی ۱۹۸ هـ.ق کۆچی دوایی کرد.

(ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەفەرموویێت: ((ئەخلاقی پێغەمبەری خوا (ﷺ) قورئان بوو. حسن بصری[8] (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەڵێت: ((ئەخلاق و ئادابی قورئانی، هەر ئەو ئەخلاقە بەرزەیە)). دەڵێت: ((**خلقٍ عظيم** هەر ئەو ئەخلاق و ئادابی قورئانییە)).

هەوەس شتێکی عارفانەیە بەڵام نەخۆشی شتێکیترە کە دڵ دەخاتە ئێش و ئازارەوە و دەبێتە هۆی بێ کەڵکی دڵ. لە فەرموودەی پێشوودا، بەخیلی لە پاڵ بوغزدا ناوبراوە. چونکە کەسی بەخیل حەز ناکات کە بەرەکەتی خوای جگە لە خۆی بەر کەسێکیتریش بکەوێت و وورده وورده بەخیلیشی بەرەق و قین و بوغز دەگۆڕێت. ئەو حەز دەکات کە نیعمەتی ئیلاهی لە کەس بەخ لێکراو بە فیڕۆ بچێت بەڵام تا خوا نەیەوێت ئەوا هیچ ڕووداوێك ڕوونادات. لەبەر ئەمەیە کە بەخیل کە دەست دەکات بە کار کردن تا بەو کەسە بەخ لێکراوە زەرە و زیان بگەیەنێت. بەم شێوەیە کە قورئان لەبارەی ئوممەتەکانی پێشووەوە دەفەرموێت: ﴿**من بعد ما جاءهم العلم بغيا بينهم**﴾ (الجاثية: ١٧) واتە: (دوای ئەوەی کە زانست و شارەزا بوون لە حەقیقەتی دین و ئەحکامەکانی لەم کاتەدا بەهۆی خۆ بە زل زانی و دژایەتی و بەخیلی یەوە، لەگەڵ یەکتردا جیا بوونەوە و جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە. جیاوازیان

[8] حسن بن ابی الحسن یسار بصری، ابو سعید بن ثابتی ئازاد کرد. شێخ خەڵکی بصره بوو. و لە سالی ١١٠ هـ.ق دا ٦٩ مالئاوایی لە دنیا کرد.

لەسەر ڕێگری و نەبوونی زانست و نەزانیانەوە نەبوو بەڵکو ئەوان حەقیان دەناسی، بەڵام هەندێك لەوانە بە هۆی بەخیلیەوە بە خەڵکیتر تێپەڕین و لە سنوور دەرچوون). انس بن مالك (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەڵێت کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: ((لاتحاسدوا ولاتباغظوا ولا تدابروا ولاتقاطعوا وكونوا عبادالله اخوانا. ولا يحل لمسلم ان – يهجره اخاه فوق ثلاث ليال، يلتقيان فيهد هذا ويصد هذا و خيرهما الذى يبدا بالسلام))[9] واتە سەبارەت بە یەکتری بەخیلی مەبەن و بوغتان نەبێت و لەگەڵ یەکدا دوژمنایەتی مەکەن و پشت هەل مەکەن لەیەکتر، و بەندەیی ڕاستی خوابن و لەگەڵ یەکدا وەکو برا ژیان برنە سەر. بۆ کەسی موسڵمان دروست نی یە کە زیاد لە سێ ڕۆژ لەگەڵ برا موسڵمانەکەیدا قسان نەکات و پەیوەندی بپچرێنێت. بە شێوەیەك کاتێك بەرەوڕووی یەکتر بوونەوە هەر یەکێك بەلایەکدا ڕووبکات شوێنێکی تر و دەموچاو بدات بە یەکدا. و چاکترینی ئەو دوو کەسە. ئەوەیانە کە سەرەتا سەلام دەکات.

لە فەرموودەیەکی تری انس بن مالك (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەڵێت: پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێت: ((والذى نفسى بيده لايومن احدكم حتى يحب لاخيه ما يحب نفسيه)). واتە سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بە دەستە، هیچ یەکێك لە ئێوە بە باوەڕدار ناژمێردرێت تا ئەو کاتەی کە ئەو شتەی بۆ خۆی خۆش دەوێ بۆ

---

٩- ئیمامی بوخاری (٥١٤٣، ٦٠٦٤) و ئیمامی موسلیم (٢٥٦٣).

براکەیشی خۆش نەوێت. هەروەها خوا لە بارەوە دەفەرموویت:
﴿وان منك لمن ليبطئن فان اصابتكم مصيبة قال قد أنعم الله على اذلم الن معهم شهيدا * ولئن أصابكم فضل من الله ليقولن كأن لم تكن بينكم و بينه مودة ياليتني كنت معهم فأفوز فوزا عظيما﴾ (النساء: ٧٢-٧٣) واته: (لەنێوان ئێوەدا کۆمەڵێك هەن کە _ دوو ڕوون و خۆیان بە یەکێك لە ئێوە دەزانن و ناچن بۆ جیهاد و، تەمەڵی دەکەن و خەڵکانی تریش تەمەڵ دەکەن و لە شەڕیان دوور دەخەنەوە. کەواتە ئەگەر بەڵاو موسیبەتێك ڕووی تیکردن دەڵێن: بە ڕاستی خوا ڕەحمی پێمان کرد کە لەوان نەبووین و _ لەشەڕدا _ بەشداریمان نەکرد. و ئەگەر ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا ڕووی تێنەکردن _ و سەرکەوتن و غنیمەتتان دەست کەوت _ ڕاست وەکو ئەوەی کە هەرگیز نێوان ئێوە و ئەوان چ خۆشەویستی و هاوڕێیەتێك نەبووە، دەڵێن: خۆزگە ئێمەش لەگەڵ ئەواندا بووینایە. و _ لەم سەرکەوتن و بەدەست کەوتنی غنیمەت _ شتێکمان پێبڕایە).

ئەمە دواکەوتووەکان و پشت لێ هەڵکەرەکانی جیهادن لە ڕێی خوادا، ئەوەی کە بۆ خۆیان خۆشیان دەویست بۆ برا موسڵمانەکانیان نەدەویست بەڵکو ئەگەر باوەڕداران بەڵاو موسیبەتێکان تووشی بوایە ئەوان حەزیان دەکرد و پێکەنیان دەهات و ئەگەر نیعمەت و بەرەکەتێك بە باوەڕداران گەشتبا ئەوا ئەوان نارەحەت و دڵ تەنگ دەبوون و حەزیان دەکرد کە ئەو

نیعمەتەش بەوان بگەشتایە. چونکە دوو ڕووەکان تەنها ئارەزووی نیعمەتەکانی دنیایان دەکرد و نوقمی دنیا پەرستن و شتی ڕووکەشی ئەو بوو. لەبەر ئەوەی ئەوان خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و ڕۆژی قیامەتیان خۆش نەویست و ئیمانیان پێیان نەبوو. ئەگەر ئەوان بە خوا و پێغەمبەر (ﷺ) و ڕۆژی دوایی ئیمانیان هەبوایە، ئەوا برا باوەڕدارەکانی خۆیان خۆش دەویست و لەو نیعمەتانەی کە بەوان دەگات خۆشیان دەهات و لەو بەلاّ و موسیبەتەی کە بە باوەڕداران دەگەشت ناڕەحەت و دڵ تەنگ دەبوون. هەر کەسێکیان دڵ خۆش نکردایە بەوەی کە باوەڕداران دڵ خۆش دەکات و ناڕەحەت و دڵ تەنگ نکردایە بەوەی کە باوەڕدارن ناڕاحەت و دڵ تەنگ دەکات. لە ڕیزی باوەڕداران ناژمێردرێت. عامر شعبی (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەڵێت: بیستم کەنعان بن بشیر (خوای لێ ڕازی بێت) لە کاتی ووتاردانیدا دەی ووت: ((سمعت رسول الله (ﷺ) يقول : مثل المؤمنين فى توادهم و ترادهم و تراحمهم و تعاطفهم كمثل الجسد الواحد اذا اشتكى منه شيء تداعى له سائر الجسد بالحمى و السهر))[10]

واتە: ((بیستم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەی فەرموو: باوەڕداران لە خۆش ویستن، بەزەیی، دڵسۆزی و مهرەبانی بەرامبەر بە یەکتری وەکو یەك لاشە وان کە ئەندامێکی ئێش بکات ئەوا ئەندامەکانی

---

[10] - بوخاری (٢٤٤٦) و موسلیم (٢٥٨٥).

**تری لاشە یەکتر بۆ چاودێری و پەرستاری و خزمەتکردنی ئەو ئەندامە هان دەدەن)).**

**هەروەها ابو موسی اشعری (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە کردنە ناو یەکێ پەنچەکانی دەستی فەرمووی:** ((المؤمن للؤمن كالبنيان يشد بعض))[11] **واتە: ((باوەڕدار بۆ برا باوەڕدارەکەی وەکو پەیکەری بینایە کە هەندیکەتری بەهێز ڕاگرتووە)).**

---

[11] - بوخاری (٢٣١٤) و موسلیم (٢٥٨٥).

# خۆبەزل زان و بەخیل

خۆبەزل زان و بەخیل لە نەخۆشیەکانی دڵ بوون و بەخیلی حسادەت لەهەر دووکیان خراپترە. لە فەرموودەیەکی سەحیحدا ابو دادود ڕیوایەنی کردووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((الحسد بأكل الحسنات كما تأكل النار الحطب و الصدقة تطفئى الخيئة كما تطفئى المال النار))[12] واتە: ((بەخیلی چاکی یەکان لەناو دەبات، هەروەکو ئاگر چۆن دار دەسوتێنێ. و خێر و خێرات، تاوان و گوناهەکان پاك دەکاتەوە هەروەکو ئاو چۆن ئاگر دەکوژێنێتەوە)).

کەسی بەخیل و خۆبەزل زان نیعمەتەکانیش لە خۆی پەشیمان دەکات و لەو نیعمەتانەی کی خوا دەی بەخشێتە بە خەلچکانی تر دڵ تەنگ دەبێت خوا دەفەرمووێت: ((**ومن يوق شح نفسه فاولئك هم المعلمون**)) (الحشر: ٩) واتە: (و کەسانێك کە نەفسی خۆیان لە بەخیلی و بوغز بپارێزن و پارێزراوبن ڕزگار دەبن).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((أيكم والشح فانه اهلك من منه كان قبلكم امرهم بالبخل فبخلوا و امرهم بالظلم فظلموا و امرهم

---

١٢ – ابن ماجه (٤٢١٠) له انس بن مالك، و ابو داود (٥٧٤/٢)

بـــالقطعوا))[١٣] واتـە: ((لـە خۆبـەزل زان بـە ڕاسـتی دوور بکەونـەوە. چونکە کەسانێك کە لە پێش ئێوەوە بوون لە ناوی بردن. ئەوانی بە بەخیلی و ستەم و بەجێ نەهێنانی سیلەی ڕەحمی قوم و خزمان ناچار کرد و ئەوانیش بەخیلی یان برد، ستەمیان بە ڕەوا دەزانـی و سیلەی ڕەحمیان پچڕاند)).

هاوەڵی بەڕێز عبدالرحمن بن عوف (خوای لێ ڕازی بێت) لـە کـاتی تەوافی ماڵی خوا ئەم دوعایەی دوبارە دەکردەوە: ((اللهم قنـی شـح نفسی)) واتـە: ((ئەی پـەروەردگار لـە بەخیلی و خۆبەزل زان نەفسم نجـاتم بـدە)). پیاوێـك پرسـی: بۆچـی ئـەم دوعایـە زۆر دوبـارە دەکەیتەوە؟ ووتی: ئەگەر خۆبـەزل زان و بەخیلی لـە مرۆڤدا ڕەگـی داکوتی ئەوا تووشـی ستەم و سەرپێچی و بەجێنەهێنانی سیلەی ڕەحمی دەکات.

کەواتـە بـەخیلی و ئێـرەی دوو جـۆر نەخۆشـین. کـە دەبنـە هـۆی ئـەوەی تـا نـەفس سـەبارەت بـەو شـتانەی کـە بـۆ ئـەو زیـان بەخـشن بۆغزو ڕەق و قینی هەبێت. و ئەوشتانەی کە بۆ ئـەو زیـان بەخـشن، خۆش بوێت. هەر لەبەر ئەمە کە بەخیلی عادەتەن لەگەڵ غزبدایە.

١٣ - گێڕانەوەی ابو داود (١٦٩٨) ٧٣ و احمد (١٥٩/٢) هريرە.

# عەشق

شـەهوەت و عەشـق دوو جـۆری تـری نەخۆشـیە کـە دەبنـە هـۆی ئەوەی تا نەفس هەر شتێك کە زیانی بۆی هـەبێت، خۆش بوێـت. و هەر شتێك کە سوودی بۆی هەبێت بە ناپەسەندی بزانێنـت. عەشـق نەخۆشـی یـەکی دەروونـی یـە هـەر کـات چـالاك بـوو دەبێتـە هـۆی نەخۆشـی یـەکی لاشـەش (سایکۆسـۆماتی) و چ جـای ئـەوەی کـە مرۆۋ تووشـی جۆرێك لـە وەسوەسە و نەخۆشـی مێشك بێـت و یـان ئەوەی کە مـرۆۋ تووشـی لاوازی لاشـە و بێهێزی ببێـت. مەبەسـتی سەرەکی لـەباس پـەراوێزی نەخۆشـی دڵ ئەمەیـە کـە دڵـی مـرۆۋ بـە هۆی ئەم نەخۆشی یەوە تووشی گۆڕانی فیترەت دەبێت و لە دیـاری کردنی چاك و خراپ تووشـی هەڵـە دەبێـت. چـاك و خـراپ بـە چـاك، زیان بە سوود و سوود بە زیـان دەزانێـت. و هـەروەك کەسـێك لێ دێ کە لە ڕووی لاشەیی یەوە نەخۆشە و هەرشتێك کە بۆ لاشەی زیـانی هـەبێت خۆشـی بوێـت. بـە شـێوەیەك کـە ئەگـەر شـتێك بـەو بوترێـت ئەوا دڵ تەنگ دەبێت و ئەگەر پێ بـدرێت ئـەوا دیـسانەوە نەخۆشـی یەکـەی زیـاد دەکـات وەکـو کەسـێك کـە عاشـقە. بیـنین، دەسـتی لێ

دانـی مەعـشوقەکەی و بیـستنی دەنگـی ئـەو دەبێتـە هـۆی ڕەنـج و ئێش و ئازاری و ئـەو لـە خـشتە دەبات. تەنانـەت بـە وێنـا کردنـی مەعـشوقەکەی شـەهوەتی دەجوڵێنێـت و سـوکنایی بـە نەخۆشـی یەکەی دێنێت. و لـە فەرموودەیەکدا هـاتووە کـە دەفـەرمووێت: ((ان الله یحمـی عبـده المـؤمن الـدنیا کمـا یحمـی احـدکم مریـضه الطعـام و الـشراب))[14] واتـە: ((خـوا بەنـدەی بـاوەڕداری لـە دنیـا پەرسـتی دەپارێزێـت، بەو شێوەیە کـە ئێـوە نەخۆشـەکەی خۆتـان لـە ئـاو و خۆراك دەپارێزن)).

لـە موناجـاتی موسـا (سـەلامی خـوای لەسـەر) کـە ئیمـام ئەحمـەد ئەوی لە کتێبـی _ الزهـد _ کـە لـە وهـب بـن جریـر[15] گێڕاوەتـەوە کـە دەڵێت: (خوا دەفەرمووێت من بەندەکانی خۆم لە دنیا پەرستی و بـیر کردنـی ئـەو دەپـارێزم بـەو شـێوەیە کـە شـوانێکی دڵـسۆز، وشـترەکانی لـە لـەوەڕگا ماندوکـەرەکان دەپارێزێـت. هـەروەها بەنـدەکانم لە ئارام گرتن لـە دنیـا و عەشـق و خواردنـەوەی دنیـایی دوور دەکەونـەوە بـەو شـێوە کـە شـوانی دڵـسۆز، وشـترەکانی لـە لەوەڕگایـەکی سـەوز و دڵخـواز دوور دەکاتـەوە. و ئەمـە لەبـەر ئـەوە نیە کە ئەوان لای من نرخ و بایەخێکیان نیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە بەندەکانم بەشی خۆیـان لـە گـەورەیی و بەخـشندەیم بـە شـێوەیەکی

---

[14] - روایت احمد (۴۲۸/۵).

[15] - ئەو وهب بن جریر بن حازم ازدی ابو العباسی بصریه. لە باوکی وشعبه و حماد بن زید فەرموودەی گێراوەتەوە. و لە ساڵی ۲۰۷ هـ.ق ماڵئاوایی کرد.

تەواو وەربگرن، و بێ ئەوەی کە دنیا و داواکاری نەفس و هەواو ئارەزوو ئەوان ناتەواو بکات.

دەبێ بزانرێت کە شیفای نەخۆش لە ڕزگار بوون لەو سووکە نەخۆشیە دەبێت. بەڵکو بە دەرکردن دەرەوەی ئەم عەشقە خراپە نەخۆش یەکە شیفای بۆ دێت. لە بارەی هۆکارەکانی عەشق، دوو ڕا هەیە: تاقمێك دەڵێن: سەرچاوەی عەشق، ئیرادەیە و نی یەتە و ئەمە قسەیەکی بڵاوە، تاقمێکی تر دەڵێن: سەرچاوەی عەشق، بیرکردنەوە و خیاڵ کردنە بە شێوەیەك کە مەعشوق لە مێشکی عاشقدا جێگەی ئەو شتە باشانە بگرێتەوە کە هەن. ئەم تاقمە دەڵێن: نابێت خوا عاشق یان مەعشوق وەسف بکرێت چونکە خوا لە خیاڵ کردن پاکە. بەڵام هەندێك لە تاقمی یەکەم خوا بە عاشق بوون وەسف دەکەن چونکە عەشق بە مانایی خۆشەویستی تەواو دەزانن، و خوا حەزدەکات. هەروەك لە گێڕانەوەیەك لە عەبدول واحد بن زید[16]دا هاتووە کە خوا دەفەرموویێت: ﴿**لایزال عبدی یتقرب الی یعةشقنی واعةشقه**﴾١٧ واتە: (پێویستە بەندە بەرەو من

---

١٦- عبدالواحد بن زید عبدی ناوە. ئەو لە ساڵی ١٧٠ هـ.ق کۆچی دوایی کرد.

١٧- ابو نعیم در حلیة الانبیاء (١٦٥/٦) ئەوەی گێڕاوەتەوە لە کۆتایدا دەڵێت: ئەم فەرموودەیە عبدالواحد لە حسن بصری بە شێوەی _ مرسل گێڕاوەتەوە. و ئەم فەرموودەیە بە یەکێك لە مرسلەکانی مقبولی حسن ناژمێدرێت چونکە لە سندی ئەودا، محمد بن فچل و عبدالواحد بن زید وجودیان هەیە و هەر دووکیان لاوازن (ضعیف) جێگەی باسە کە یحی بن معین محمد بن فضلی لە جێگەیەکدا بە درۆزن لە قەڵەم دەدات و لە جێگەیەکیتردا دەڵێت کە هیچ نیە. الکبیر (١٢٠/٤) و ئیمامی بخاری لە بارەی عبد الواحد بن زیدوە دەڵێت: فەرموودە ئەویان تەرك کردووە و یحی بن

نزیك ببنەوە. عەشقی لەگەڵ مندا هەبێت و منیش عەشقم لەگەڵ ئەودا دەبێت). ئەمە قسەی هەندێك لە سوفی یەکانە کە بە بڕوای زانایان (جمهور العلماء) ئەوە لەبەرامبەر زاتی پیرۆزی خوادا قەبووڵ ناکەن و ئەم جۆرە قسانە بە شایستەی خوا نازانن. چونکە عەشق ئاشکرا و خۆشەویستی کەسانێك کە زیاد لەم دوو ئەندازەیەتی. و ئەم خۆشەویستی یە ماوە و کاتێکی دیاری کراوی هەیە. هەر لەبەر ئەمە دەڵێن بەکار هێنانی ووشەی عەشق لەبەرە خواوە بە تەواوی ناشایستە و ناڕەوایە. دەربڕینی عەشق زۆر زیاتر لە سوودی عبادەتەوە بە خۆشەویستی مرۆیی بۆ ژن یان منداڵەکەی ڕەوایە و خۆشەویستی بە خێزان و پۆست و پلەوپایە و پێغەمبەران و پیاو چاکان و ئەمانە ناگرێتەوە. هەروەها ووشەی عەشق گارانتی ئەنجام دان هەندێ لە کاری حەرام و دژی پاکی یە. لەواندا دەست لێ دان و سەیرکردنی ژنی نامەحەرەم و کوڕی گەنج و جوان...! تەنانەت خۆشەویستی کەسانێك سەبارەت بە ژن و خزمەتکاری خۆی، بە ڕادەیەك کە ببێتە هۆی بەڕەوا زانینی ستەم بە ژنێکی تر ویان تووشی کاری حەلام بێت، ڕاست نی یە و ناشەرعی یە. بۆ نموونە بە گوێ کردن و خۆشل کردن لە بەرامبەر داواکارییە ناشرعی یەکانی هاوسەری خۆت کە ج جایئەوەی کە

---

معین لە بارەیەوە دەڵێت: ئەو هیچ نیە. سەیری الضعفاء الکبیر (٥٤/٣). لەبەر ئەوە ئەم گێڕانەوەیە ناتوانرێ بەڵگە و دەلیل بێت. (وەرگێڕ)

دنیا و دواڕۆژی نابووددەکات. وەکو ئەوەی کە ماڵ و سامانێك بخرێتە بەردەستی کە ئەو...ببات و یان لە میراتدا بەشێك و حەقێکی زیاتری بۆ دابنرێت..ئەمەیە حاڵی عەشقی حەلاڵ.

کەواتە عەشق بە ژنی بێگانە و کوڕی گەنج و جوان کە حەرامە، مرۆڤ تووشی چ وسایایەك دەکات؟! دەبێ بزانرێت کە لە ئەنجامی ئەم جۆرە کردەوانەدا ژمارەیەکی زۆر فاسد نادیارن کە دین و ئابڕووی مرۆڤ لە ناو دەبن و عەقڵ و لاشە سست و نابورد دەکەن. هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿**فلا تخضعن بالقول فيطمع الذي في قلبه مرض**﴾ (الاحزاب: ٣٢) واتە: (ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ)! دەنگتان نەرم و ناسك و مەکەنەوە کە دڵ نەخۆشەکان چاوی تەماع ببڕنە ئێوە).

کەسێك کە لە دڵیدا نەخۆش شەهوەت بێت و لە سەیر کردنی دەموو چاوە جوانەکان تام و چێژ وەربگرێ، و هەرکات ون بووەکەی کە لە بیریایەتی پەیدا بکات ئەو نەخۆشی یەکی گەڕانەوە دەبێت و لە بەدوادا چوون و بەدەست هێنانی ئەوەیە کە لە بیریدایە. بە پێچەوانەوە کەسێکەوە کە لە گەیشتن بە وون بووەکەی بیریایەتی سست بێت کە لە کۆتایدا وورده وورده بێ هیوایی لە عەشق و خۆشەویستیدا دروست دەبێت. بەڵام ئەگەر کەسێك کەوتە ناو داوی عەشق و خۆشەویستیەوە، و داوێن پاکی و ئارام گرتنی کردە پیشەی خۆی ئەوا ئەم کەسە بە هۆی تەقوایەك کە لە

بەر خاتری خوا گرتۆتەبەر، پاداشت وەردەگرێ. هەروەك ئەوەی کە لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە دەفەرموویێت: ((أن من عشق نغق و صبر ثم مات کان شهيدا))[18] واتە: ((هەر کەس کە عاشق بوو و لەسەر ئەوە داوێن پاکی و ئارام گرتنی گرتە پیشە. ئەگەر لەم حاڵەتەدا بمرێ ئەوا شەهیدە)).

هەڵبەتە ئەم فەرموودەیە یحی القتات لە موجاهید لە عەبدوڵلای کوڕی عەباس بە شێوەی (مرفوع) گێڕاوەتەوە و فەرموودەیەکی صحیح نیە. بەڵام ئەم بابەتە ئاشکرا و دیارە کە ئەگەر کەسێك لە حەرام کراوەکان چاو پۆشی بکات و لە سەیرکردنی حەرام و قسانی حەرام و کرداری حەرام پارێز بکات و دوور بکەوێتەوە و ئەوەی لە دڵیدا هەیە نەی خاتەڕوو تا تووشی ناپەسەند و کرداری ناشایستە نەبێت و بە ئیش و ئازاری عەشق لە دڵدا ئارام بگرێت. ئەوا کەسێکی وا بە خاوەن تەقوا دەژمێرێت و لەلای خواوە موستەحەقی پاداشتێکی زۆرە. هەروەك دەفەرموویێت: ﴿انه من یتق ویبصر فان الله یضیع أجر المحسنین﴾ (یوسف: ٩٠) واتە: (بێگومان هەرکەس تەقوای کردە پیشە و _ لەبەرامبەر ڕوودا و

---

[18]- خطیب بغدادی لە مێژووی بغدادا (٥/١٥٦-٢٦٢/ ٥٠-٥١) ئەوەی گێڕاوەتەوە و ابن قیم ئەوەی لە زاد المعاد (٤/٢٧٥ -٢٧٧) دا هێناوە دەڵێت: (ئەم فەرموودەیە لە پێغەمبەر (ﷺ) وەر نەگیراوە و ئەسڵەن جایز نیە کە لە قسانی ئە پێغەمبەر (ﷺ) بن چونکە شەهیدی لای خوای گەورە، پلەوپایەی گەورەیی هەیە کە لە پاڵ پلەوپایەیی ڕاستگۆیاندایە. و کار و کردەوەی تایبەتی خۆی هەیە.

موسیبەتەکاندا ئارام بگرێت _ ئەوا خوا پاداشتی دەداتەوە _ لەبەر ئەوەکە خوا چاکەی چاکەکاران وون ناکات).

ئەم یاسایە لە بارەی بەخیلی و نەخۆشیەکانی تری دڵ، ڕاستی پەیدا دەکات و دەچەسپێت. ئەگەر نەفسی مرۆڤ عادەتی کرد بەشتێکەوە کە ببێتە هۆی تووڕەیی و ناڕەحەتی خوای گەورە و ئەوا دەچێتە ڕیزی موژدە پێدراوەکانەوە. کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا باس کراوە: ﴿و أمانه خاق مقام ربه ونهى النفس عن الهوى * فأن الجنة هى الماى﴾ (النازعات ٤٠-٤١) واتە: (وبەلام ئەو کەسەی کە لە جێگە و پلەوپایەی خوای گەورە بترسێت و نەفسی لە هەوا و ئارەزوو دوور بخاتەوە، بە دڵنیایەوە بەهەشت جێگایەتی). بەو شێوە کە دەزانن ئەگەر خۆشەویستی شتێك لە دڵدا جێگەی گرت ئەوا مرۆڤ هەوڵ دەدات کە ئەوشتە بە دەست بهێنێت تەنانەت دەست دەخاتە هەندێ کار و بارەوە تا زەمینەی بە دەست هێنانی بۆ ساز بکات.

کەسێك کە خۆشەویستی پیس و ناشەرعی یان بوغز و ڕەق و قینی لە دڵدا هەبێت و ئەوانە بکات بە پراکتیکی ئەوا تاوانبارە. بۆ نموونە کەسێك لە ڕووی بەخیلی یەوە حەزدەکات و حەقی کەسێکی تر دەخوات و لە بەرامبەر حەقیدا دژایەتی دەکات. یان کەسێکی زیاد لە حەد خۆش دەوێ بە هۆی ئەوەوە تووشی حەرامێك دەبێت و یان واجبێك تەرك دەکات. و هەندێ شت بە

هـۆی لێکـچوونی لەگـەڵ ئـەودا خۆشـی دەوێـت. هـەروەك کەسـێك وتوویەتی:

**لأحب لحبها السودان حتى    أحب لها سود الكلاب**

بە هۆی خۆشەویستی ئەوەوە هەموو ڕەشەکان و تەنانـەت سـەگە ڕەشەکانم خۆش دەوێ.

شاعێر لەبەر ئەوەی ژنێکی ڕەش پێستی خۆش دەوێت، یـەعنی لەبـەر خـاتری مەعـشوقەکەی تەنانـەت سـەگە ڕەشەکانیـشی خـۆش دەوێ! ئەمانـە نەخۆشـیەکانی دڵـن کـە لـە بیرکردنـەوە و ئـیرادەی فاسـدی دڵ سەرچـاوە دەگـرن. لـە خـوای گـەورە داواکـارین کـە دڵـەکانمان لـە هـەموو نەخۆشـی و دەردێـك شـیفا بـدات.(ئـامین) هـەروەها لـە نـەهی کراوەکـان و کـارەپیس و ناپەسـەندەکان پـەنای پێ‌دەبین. چونکە دڵ بۆ خۆشویستنی خوایە و ئەمـە فیترەتێکە کـە خـوا بـە بەنـدەکانی لەسـەر ئـەوە دروسـت کـردووە بـەو شـێوە کـە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێت: ((اکـل مولـود یولـد علی الفطرة، فابواه یهودانه او ینصرانه او یمجسانه، کما تنتج البهیمة جمـاء هـل تحـسون فیهـا مـن جـد عـاء))[19] واتـە: ((هـەموو مرۆڤێك لەسـەر فیترەتی خواناسی لە دایك دەبێت. وەڵێ باوك و دایکی دەیکـەن بـە جوولەکە یان مسیحە یان جووسی. بەو شێوە کەبێـچووی ئاژەڵ بـە ساغ و سەلامەتی لـە دایـك دەبـێ وەڵێ دوایـی تووشـی کـەم ئەنـدامی

---

١٩ گیرانەوەی بخاری (٦٥٩٩ ١٣٨٥ - ١٣٥٩ ١٣٥٨) و مسلم (٢٦٥٨)

دەبێت)). ابو هریرە دوایی گەڕانەوەی ئەم فەرموودەیە ووتی: ((ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەت بخوێنن)). ﴿**فطرة الله التی فطر الناس علیها لاتبدیل لخلق الله**﴾ (الروم: ٣٠) واتە: (ئەمە سروشتێکە کە خوا مرۆڤەکانی لەسەر ئەوە دروست کردووە، نابێت سروشتی خوا بگۆڕێت). یەعنی ئەوە لە خواناسی بە کوفر و لەدینداری بە بێدینی لێبخوڕێ (غاربدەن).

خوا بەندەکانی لەسەر بنەمای خۆشەویستی و بەندایەتی و یەکتاپەرستی خۆی، دروست کردووە. ئەگەر فیترەتی وجوودی مرۆڤ ئازاد بکرێت تا گەشە بکت، ئەوا دەی بینی کە خوا دەناسێت و خۆشەویستی خوا لە دڵیدا جێگای هەیە. بەلام بە داخەوە فیترەتە پاکەکان بە هۆی گەشەیان لە جەوی و هەوای ناپاك و پیس حاڵەتی ئەسڵی و ئاسایی خۆی لە دەست دەدات. و بە جوولەکەو نصرانی و...پەیدا دەکات. هەڵبەتە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت و بڕیاربدات بۆ ئەو فیترەتە ئەسڵییەی خۆی دەگرێتەوە.

پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر) بۆ گۆڕانی فیترت و غاردان بەرە و فیترەتێکی تازە نەهاتوون. بەڵکو بۆ جێگیر کردنی ئیمان و گەڕاندنەوەی بەشەرییەت بەرە و غیرەتی ئەسڵی خۆیان هەڵبژێردراون و هاتوون. ئەگەر لە دڵی مرۆڤدا خۆشەویستی ڕاستی خوایی جێگا بگرێت. ئیتر تووشی خۆشەویستی یەکی تر بە غەیری خوا نابن. چ جای ئەوەی تووشی خۆشەویستی ببێت

سـەبارەت بـە مەعـشوقێك. بـە دڵنیاییـەوە کاتێـك کـە دڵ تووشـی عەشق بە مەعشوقێك دەبێت ئەوا خۆشەویستی بەرامبەر بە خوا کـەم دەبێتـەوە لەبـەر ئـەم خۆشویـستنی پاکانـە بـوو کـە یوسـف (سەلامی خوای لەسەر) خوا پارێزگار لێ کرد: ﴿كذلك نصرف عنه السوء و الفحشاء انه من عبادنا المخلصين﴾ (یوسف: ٢٤) واتە: (ئێمە بـەو شـێوەیەمان کـرد _ و بـۆ پارێزگـاری کردنـی ئـەو لـە هـەموو قۆناغەکاندا هەوڵماندا _ تا بەڵا و زینا لـەو دوور بکەوینـەوە. لەبەر ئەوە کە ئەو لە بەندەکانی پاك و هەڵبـژێردراوی ئێمە بوو). بەڵام ژنی عزیز _ زلێخا _ و ژنانی هۆزەکەی هاوبەش بوون. لەبەر ئەمە بـوو کـە عاشـقی یوسـف (سـەلامی خـوای لەسـەر) بـوون و دەبـێ بزانرێت کـە مـرۆڤ بـە هـۆی کاریگـەری کـەمی و ناتـەواوی لـە یـەکتا پەرستی و ئیمانـدا تووشـی ئـەم جـۆرە عەشـقە درۆییانـە دەبێـت و گرفتار دەبێت. چونکە دڵێك کە پڕبێت لە ئیمان بە خـوا و بـەردەوام بـەرە و ئـەو بگەڕێتـەوە و لـە خـوا بترسـێت، لـەم جـۆرە مەسـەلانەدا دووشت دەبنە ڕێگر کە سەرلێ شێواو نەبێت: یەکێك ئەوە کە تەوبـە و گەڕانەوە بەرە و خوا لـە هـەر عەشـق و خۆشەویـستی یـەك، تـام و چـێژێکی زیـاتری هەیـە. و خۆشەویـستی خـوا لـە دڵـدا بەسـەر خۆشەویستی شتەکانی تر سەر دەکەوێت.

دووەم ترس لە خوا: چونکە ترس لە خاڵی بەرامبەر عەسقدایە و بەردەمی دەگرێت. هەرکەس کە مەسەلەیەکی خۆش بوێت لە ڕووی

عەشقەوە یان غەیری عەشقەوە- پاشان سەبارەت بە مەسەلەیەکی تر کە تیادا خۆشەویستی یەی سەبارەت بە مەسەلەی دووەم ئەو کەسە لە نزیکە بوونەوە لە خۆشەویستی مەسەلەی یەکەم دەگەڕێنێتە دواوە. و یان بە هۆی ترس لە تووش بون بە زەرەرێك کە بە هۆی دروست بوونی خۆشەویستی بەرامبەر بە کەسێك ببێت بێتە پێشەوە بۆی ئەوا لەو خۆشەویستی یە هەڵدەگرێ.

بە لێکۆڵینەوەی ئەمانە کە باس کران گەیشتینە ئەم ئەنجامە کە هەر کات خوا لە دڵی بەندەیەکدا لە هەموو کەسێکی تر بترسێت، لە دڵی کەسێکی وا تەها خۆشەویستی خوا جێگای دەبێتەوە نەوەك خۆشەویستی کەسێکی تر. مەگەر ناگاییەك بێتە پێشەوە و میزانی خۆشەویستی و ترس لە خوا لاواز بێت. چونکە ئیمان بە خوا بەجێبەجی کردنی دەستوراتی ئیلاهی، زیاتر و سەرپێچی لە دەستوراتی، کەمتر دەبێت.

کەواتە هەر کاتێك کە، مرۆۋ بە هۆی خۆشەویستی و ترس لە خوا کرداری شایستە ئەنجام بدات و لە تاوان و گوناهەکان دەست هەڵگرێت. دۆستی و ترس لە خوا زیاتر دەبێت و خۆشەویستی غەیر خوا لە دڵیدا وشك دەکات. نەخۆشیەکانی لاشەش هەر بەم شێوەیەن. ساغ و سەلامەتی لاشە بە هۆکاری سوود بەخش بە دەست دێت و نەخۆشی و ئێش و ئازار بە هۆی هۆکاری دژی ئەوەوە لەناو دەچن.

داودەرمــان هۆکارێکــە کــە نەخۆشــی لاشــەیی شــیفا دەدات. هەروەها بۆ دڵیش دەبێ دەرمانێك هەبێت کە نەخۆشیەکانی دڵ لە ناو ببات. ساغ و سەلامەتی دڵ بە باوەڕ بوون بە خوا و یەکتا پەرسـتی بەدەسـت دێـت و بـە بـەردەوامی بـوونی بەندایـەتی و یەکتاپەرستی ئەویش بەردەوام دەبێت. باوەڕ و زانستی سوود بەخشی و کردەوەی چاکە لازم و مـەلزومی یـەکترن و مانـەوە و سەلامەتی دڵ پەیوەنـدی بـەم سـێ شـتەوە هەیـە کـە لـە ڕاسـتیدا خـۆراك و دەرمـانی دڵیـشن. هـەروەك لـە فەرموودەیەکـدا کـە لـە عەبـدولا بـن مەسـعود (خـوای لێ ڕازی بێـت) گێڕدراوەتـەوە کـە دەفەرمووێت: ((ان کل ادب یحـب ان تـؤتی مأدبتـه و ان مادیـة الله هـی القـران))[20] واتـە: ((هـەموو میوانـدارێك حـەز دەکـات کـە خـۆراکی میوانی یەکەی بخورێت و میوانی خوا قورئانە)).

هەروەها بەشـەکانی کۆتـایی شـەو و کاتـی بانـك و نوێـژ و لـە نـاو سـوجد دا و دوای نوێـژەکان و زیکـر و ویـرد وتـن، و هەنـدێ بابەتی تـر لـە جوانی و پاکی خـوای گـەورەن. زیکـر داواکردنـی لێ خۆش بوونی تاوان لە خوا مەسەلەیەکی گرنگ و جیدییە کە دەبێ کەسی موسڵمان ئاگاداری ئەو شتانە بێت و سـەرنجیان بـدات. هـەر کە خوا داوای فێربوون بکات و تەوبە بکات، خـوا تەوبە و داواکەی

---

٢٠- گێڕانەوەی دارمی (٢/٥٢١ ٥٢٣) و طبرانی لە المعجم الکبیر - (٩/١٢٩ - ١٣٠) و عبدالرزاق (٣/٣٦٨ - ٣٧٥) و ابن ابی سیبلە (٦/١٢٥ - ١٢٦) وەکو گێڕانەوەی سەرەوە ریوایەتیان کردووە.

قــەبووڵ دەکــات و بــە جێگــای گونــاه و تــاوان لــە کارنامــەی کردەوەکانیــدا چــاکیەکان جــێگیر دەکــات. یــەکێ لــە بەڵگــە و نیــشانەکانی دیــاری ئــەم مەســەلەیە فــەرموودەیی خوایــە کــە دەفــەرمووێت: ﴿یاایها الذین امنو توبوا الی الله توبة نصوحا عسی ربکم ان یکفر سیاتکم و یدخلکم جنات تجری من تحتهم الانهــار﴾ (التحریم: ٨) واتە: ((ئەی باوەڕداران بگەڕێنەوە بەرەو خوا و تەوبەیەکی صــاف و بێگــەرد بکــەن تــا پــەروەردگاری ئێــوە، لــە گونــاه و تاوانــەکانتان خــۆش ببێــت و لــە ناویــان ببــات. و ئێــوە بخاتــە نــاو باخــەکانی بەهەشتەوە کە لە ژێر ئەوانەوە ڕووبارەکان بە خوڕن)).

دەبێت ڕۆژانەو لە کاتی خەودا پارچەکەیەك لە زیکر و ویردی بخوێنــێ و ئــارام گــرتن بکاتــە پیــشە و ڕاوەســتا و بمێنێــت. بــە ئەنجامدانی ئەم کارانە زۆر ناخایەنێت کە لێ خۆشبوونەکانی خوا ئەویش دەگرنەوە و باوەڕ لە دڵیدا جێگیر دەبێت. و بە ئەنجامدانی نوێــژەکانی پێــنج فــەرزە بــە شــێوەیەکی تــەواو و چ بــە ئاشــکاری چ دەروونی دەبێ حەزت لێ هــەبێت. چونکە پایە و ستوونی دینە. و ڕستەی: ﴿لاحول ولا قوة الا بــالله﴾ بکــات ویردی ســەرزمان. یەعنی لە هیچ هەوڵ و کۆششێك کارێك ئەنجام نادرێت مەگەر بە هاوکاری و هێزی خوا نــەبێت. بە ووتنــی ئــەم وویــردە موسیبەتە قورســەکان سووك دەبن و تــرس و خــۆف لــە نــاو دەچێت. و هــەروەها دوعــا و داواکاردنمــان لــە بیرنــەچێت چــونکە دوعــا مرۆڤــی موســڵمان بــە

مەرجێك کە پەلەی تێدا نەکات وەردەگرێت. یەعنی ئەڵێن: هەر چەند دوعا دەکەم وەرناگیرێن یان خوا! من ئەم هەموو دوعایە دەکەم بەڵام تۆ قبووڵیان ناکەیت. چونکە یەکێك لە هۆکارە گرنگەکان لە وەرنەگیرانی دوعا پەلەکردنە لە وەرگرتن و قبوڵ کردنی. دەبێ بزانرێت کە هاوکاری خوا و سەرکەوتنی لە مەرجی ئارام گرتن و خێر و خۆشی یە لە دوای ڕەنج و ناڕەحەتی و ناخۆشی وئاسانی دوایی ناڕەحەتی و پەرێشانی و قورسیە. هیچ کەسێك تەنانەت پێغەمبەرانیش (سەلامی خوایان لەسەر بێ) بە ئەنجام و نەتیجەی چاك و خێر نەگەیشتوون مەگەر بە ئارام گرتن نەبێت. کەواتە سپاس و ستایش بۆ خوایەکە کە دروستکەری جیهانیانە و سپاس و شوکر و مننەت بۆ ئەوە بە هۆی نیعمەتی _ ئیسلام و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) _ کە بەخشیویەتیە بەندەکانی، ئەوەندە سپاس و ستایشی کە لەبەرامبەر نیعمەتەکانی ڕووکەش (ظاهر) _ سەلامەتی لاشە و سوڕان و ڕۆیشتنی سروشتی ژیان _ و ناوەڕۆك (باطن) و _ باوەڕ و خواپەرستی _ بەس و وەڵام دەرەوە بێت و شایستەی زاتی پاکی خوای گەورە بێت. و درووود و سەلامی خوا لەسەر سەروەرمان پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) و ئیسلام، محەمەد بن عەبدولا (ﷺ) و ئال و هاوەڵ و هاوسەرە پاکەکانی کە دایکی باوەڕدارانن و لەسەر پەیڕەوانی ڕاستی ئەو پێغەمبەرە نازدارە (ﷺ) تا ڕۆژی دوایی.

# زیاد کراوەکانی لێکۆڵەرەوە

الحمد لله رب العالمين وصلى على نبينا محمد (ﷺ) و على اله و صحبه وسلم.

لەبەشەکانی پێشوودا ئاماژە درا بەم مەسەلەیە کە چاکی و سەلامەتی حاڵی مرۆڤ لە دادپەروەریدایە و بێسوودی و بێ کەڵکی لە ستەمدا. خوا دادپەروەر و دروستکراوەکانیشی ڕاسپاردووە بە چەسپاندنی دادپەروەریی. ساغ و سەلامەتی لاشە لە مەرجی سەلامەتی و ساغی ئەندام و برینەکان نادیارن و لە ناو بەرەکان و کەم و کوڕی یە بەدەست هاتووەکان لە ئەندامی لاشەدا، دەبن هۆی کەم ئەندامی لە لاشەدا. خۆگرتن و ئارام گرتنی دڵیش لە مەرجی باوەڕ و کردەوەی چاکەیە و بە نەمانی ئەوانی دڵ تووشی نەخۆشی و لە کۆتایدا مەرگ دەبێت. خوا لە چەند شوێنێکی قورئاندا نەخۆشی دڵ و چارەسەری ئەوانی باس کردووە. و لە

فــەرموودەکانی پێغەمبەریــشیدا (ﷺ) ئاماژەیــەکی زۆری بــەم مەسەلەیە دراوە. خوا لە بارەی دوو ڕوەکانـەوە دەفەرمووێت: ﴿فـی قلوبهم مرض فزادهم الله مرضا﴾ (البقرة: ١٠) واتە: (لـەناو دڵەکانیانـدا نەخۆشی _ بەخیلی و ڕەق و قینیـان لەگـەڵ باوەڕدارانـدا _ هەیـە و خـواش _ بـە هاوکـاری کـردن و سەرخـستنی حـەق _ نەخۆشـی ئەمانە زیاتر دەکات). ﴿فتری الذین فی قلوبهم مـرض یـسارعون فـیهم﴾ (المائـدة: ٥٢) واتـە: (دەبینـی کەسـانێك کـە نەخۆشـی _ لاوازی و گومـان و دوو ڕوویـی _ لـە دڵەکانیانـدا هەیـە _ لـە دۆسـتایەتی و هاوکـاری کـردن لەگــەل جوولەکــە و مەسـیحی یەکانــدا- لەگــەڵ یەکتردا ڕکابەری دەکەن).

﴿ویشف صدور قوم مؤمنین ویذهب غـیظ قلـوبهم﴾ (التوبـە: ١٥) واتـە: (تـا خـوا سینەکانی ئەسڵی ئیمـان شیفا ببخشێت _ و لەسـەر دڵـە بریندارەکەیان هەتیوان (مەرهـەم) بـدات _ و دەردی دێرینـەی ئێش و ئازاری موشریکان لە دەروونی ئەواندا لاببات).

﴿قد جاءتکم موعظة مـن ربکـم وشـفاءً لمـا فـی الـصدور وهـدی ورحمـةً للمؤمنین﴾ (یونس: ٥٧) واتە: (لە پەروەردگارتانـەوە بۆ ئێـوە پەنـد _ و ڕێگـە و ڕێنمـایی ژیـان _ و چارەسـەرێك بـۆ ئـەو شـتانەی کـە لـە سـینەکاندایە _ وەك شـریك و دوو ڕوویـی و ڕەق و قـین و سـتەم و دوژمنی لەگەڵ حەق و ڕاستیدا _ هاتووە).

﴿و ننزل من القران ماهو شفاء و رحمة للمؤمنين﴾ (الإسراء: ٨٢) واتە: (ئێمە ئایەتەكان لە قورئاندا دادەبەزێنین كە دەقبنە هۆی چاكبوونەوەی _ دڵەكان لە نەخۆشی نەزانی و گومڕایی و پاك و بێگەرد كردنی دەروون لە پیسیەكانی هەوا و ئارەزوو و بێبڕوایی _ و ڕەحمەتن بۆ باوەڕداران).

﴿وقل هو للذين امنوا هدى وشفاء﴾ (الفصلت: ٤٤) واتە: (بڵێ: قورئان بۆ باوەڕداران مایەیی ڕێنمایی و شیفایە). ﴿فلا تخضعن بالقول فيطمع الذى فى قلبه مرض﴾ (الأحزاب: ٣٢) واتە: (دەنگتان نەرم و ناسك مەكەنەوە كە دڵە نەخۆشەكان چاوی تەمەع ببڕنە ئێوە).

﴿لئن لم ينته المنافقون والذين فى قلوبهم فى قلوبهم مرضٌ والمرجفون فى المدينة لنغرينك بهم﴾ (الأحزاب: ٦٠) واتە: (ئەگەر دوو ڕووەكان و دڵ نەخۆشەكان و كەسانێك كە لە مەدینەدا _ هەواڵ و خەبەری درۆیین بڵاو دەكەنەوە و _ دەبنە هۆی لەرزین _ باوەڕداران و لەق بوونی ئاینیان _ لەكار و كردەوەی خۆیان دەست هەڵنەگرن ئەوا تۆ دژی ئەوان هان دەدەین و مەسەلەكە و تنیشت پیدەبەخشین).

﴿واذا يقول المنافقون و الذين فى قلوبهم مرض ما وعدنا الله ورسوله إلا غروراً﴾ (الأحزاب: ١٢) واتە: (و لەبیری مەكەن كاتێك كە دوو ڕووەكان و ئەوانەی كە لە دڵەكانیاندا نەخۆش _ دوو ڕوویی _ هەبوو دەیان ووت: خوا و پێغەمبەری (ﷺ) جگە لە پەیمانی درۆ

هیچ بە ئێمە نەداوە). هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: ((هلا سألوا اذا لم یعلموا فان شفا العی السوال)) واتە: ((ئەگەر نەتانزانی بۆچی پرسیارتان نەدەکرد؟ چونکە شیفای نەزانین و نەفامی پرسیار کردنی)).

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەزانی بە یەکیچك لە نەخۆشیەکانی دڵ دادەنێت و پرسیار کردنیش بە شیفای ناو دەبات. بۆ نموونە کەسێك لە مامۆستاکەی خۆی پرسیارێك لە مەسەلەیەك دەکات. و دوای وەرگرتنەوەی وەڵام دەڵێت: ((الان شیفیتنی یا استاذ)) ((شیفام بۆ هات یان چارەسەریان کردم مامۆستا)) لە صحیحی بخاریدا لە عەبدولا بن مەسعودەوە (خوای لێ ڕازی بێ) گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ان احدا لایزال بخیر ما اتق الله واذا شك فی تفسیر شی سال رجلا فشفاه))[21] واتە: ((مرۆڤ تا کاتێك کە لە خێر و چاکەدابێت کە تەقوای ئیلاهی هەبێت و ئەگەر لە ڕاڤە و فکر و هزریدا شتێك ڕوویدا کە کێشەی تێدابێ ئەوا لە کەسێك پرسیار بکات تا شیفای بۆ بێت یان چارەسەری دەردی بکرێت)).

ئەوەی کە خوا لە باسی نەخۆشی دڵ و چارەسەری ئەودا نەخشەی کێشاوە بە پلەی مردن، لاڵ بوون، کەڕ بوون، کوێر بوون، دڵ زیندوو بوونی، بیستنی، بینین و عەقڵی دڵە. ئەم کردەوە و

[21] _ صحیح بخاری (٢٨٠٣)

سیفەتانە کە باس کران لە ڕووی مەعنەوی بە تەواوی لە بارەی دڵەوە جێگیرن، چونکە دڵێک کە ئیمانی تێدا بێت، زیندووە. ڕاستیەکان بە چاو و دڵ دەبینێت، و دەبیستێت و لەبارەیانەوە بیردەکاتەوە. و دڵێک کە کوفر و بێباوەڕی تێدابێت، مردووە. ڕاشتیەکان بە چاو و دڵ نابینێت، و لە بارەیانەوە بیرناکاتەوە.

# جۆرەکانی نەخۆشی لاشە

جۆری یەکەم:ـ بە هۆی تێکچوونی لاشە بە هۆی هەست و سۆزەکانەوە.

جۆری دووەم:ـ تێکچوونی لاشە لە جووڵەی ئاسایی و کردەوەی دەرەوەیی (ظاهری). هەر دوو جۆروی نەخۆشی دەبنە هۆی ئێش و ئازاری لاشە، هەر بەو شێوەیەکە بە ساغ و سەلامەتی ئەوانە خۆشی و شادی بە دەست دێت. و خوا بەندەکانی دەپرسێتەوە لە بارەی نیعمەتەکانی یەوە هەروەك دەفەرمووێت: ﴿ثم لتسألن يومئذ عن النعيم﴾ (التكاثر: ٨) واتە: (لەو ڕۆژەدا لە نیعمەتەکانی لێ پەرسینەوەتان لێ دەکرێت). یەعنی لە شوکر کردن و سوپاس کردنی لە بەرامبەر ئەم نیعمەتانەوە پرسیارتان لێ دەکرێ. تەندروستی، سۆزی بەجێ و جووڵەی ئاسایی ئەندامی لاشە دەبنە هۆی شادی و زەمینەسازی گەڕانی باشی لە نیعمەتەکان بەدەست دەێنێت.

کەواتە تام و چێژ و ئیش و ئازار لەگەڵ نەخۆشی وایە و هەندێ جار بەشێك سوکنایی دێت بەڵام دوایی ماوەیەك و بە لەناو چوونی

هۆکاری سوکنایییەکە دوبارە سەرهەڵدەداتەوە کەواتە بۆ چارەسەر پێویستی بە دەرمانێکی بەردەوام و درێژخایەن هەیە تا نەخۆشی یەکە بە تەواوی نامێنێت و لەناو دەچێت.

تام و چێژ و ئێش و ئازاری دڵ، گەورەترە لە تام و چێژ و ئێش و ئازاری لاشە. و تەبعەن نەخۆشی دڵ و چارەسەری ئەو، گەورەتر و قورسترە لە نەخۆشی لاشە و چارەسەریشی. هەندێ جار نەخۆشی دڵ لە شبهە و گومانەوە سەرچاوە دەگرێت. هەر وەك چۆن خوا دەفەرموویێت: ﴿**فیطمع الذی فی قلبیه مرض**﴾ (الأحزاب: ٣٢) واتە: (کە دڵ نەخۆشەکان چاوی تەماع دەبڕنە ئێوە).

الخرائصی لە کتێبی _ اعتلال القلوب بالاهواء _ دا دەنووسێت: لە ناو دڵی دوو ڕووەکاندا، نەخۆشی فەساد و بیروباوەڕ هەیە و لە ناو دڵی ستەم لێکراوان دا دەردێك هەیە کە بەرهەمی ستەمی خەڵکانی ترە و کاتێك کەستەم لێکراو حەقی وەردەگرێتەوە ئەوا سوکنایی بۆ دێت. بەو شێوەیە کە خوادەفەرمووێت: ﴿**ویشف صدور قوم مؤمنین * ویذهب غیظ قلوبهم**)) (التوبة: ١٤-١٥) واتە: (و خوا بە سینەکانی ئەهلی ئیمان شیفا دەبەخشێت و ڕق و کینەیان لە دڵدا لادەبات). ڕق و قین کاتێك لە دڵ دێتە دەرەوە کە ئێش و ئازاریشی نەمێنێت وەکو ئەوەی کە ئەگەر کەسێك بینین و بیستنی خۆی لە دەست بدات ئەوکات چەند ئێش و ئازار و ڕەنج دەبینێت و تا بینین و بیستنەکەی نەگرێتەوە ئەوا ئێش و ئازاری تەواو نابێت.

دڵـی مـرۆڤیش هـەر هـەمان حاڵـەتی هەیـە تـا ئـەو شـوێنەی کـە زۆرینەی حەق نەبێت و لەبارەی ئەوەوە بیرنەکەنەوە و نەتوانن لە نێـــوان خێـــر و شـــەڕە گـــومڕایی و هیدایـــەت، ڕەوا و نـــاڕەوا بەراوردبکات ئەوا تووشی گەورەترین نەخۆشی و ئێش و گرفتاری دەبێـت. باسـی تێکـەڵاویش هـەر بـە شـێوەیە، ئەگـەر کەسـێك ئیشتیهای خواردنی شتە خراپەکانی پەیدا کرد و عادەتی پێکرد. بـۆ نموونـە بـە خـواردنی خـاك و قـوڕ عـادەتی کـرد. ئـەوا دەبـێ تەحەمولی ئێش و ڕەنجێکی قورس و زۆر بکات چونکە لە لایەکەوە خواردنی ئەمانە زیانی هەیە و لە لایەکی تریشەوە نەخواردنیان ئێش و ئازاری هەیە! پێویستە کە ئەو کەسە چارەسەری خۆی بکات تا ئیشتهایی بگۆڕێت. مەسەلەی دڵیش هەر بەم شێوەیە کە ئەگـەر پەرۆشـی شـتێك بـوو کـە سـوودێکی نـەبێ بـۆی، وەکـو: خۆشەویستی و عەشق بەرامبەر بە ژنانی بێگانە و هەروەها بە پۆست و پلەوپایە و ماڵ و سامان، و بە نەگەیشتنی بەم شتانە، هەسـت بــە ســەرنەکەوتنی و شــەرمنی و داڕووخــان دەکــات و بەگەیشتن بەو شتانەش تووشی زیان دەبێت. لەم ڕووە پێویستە کە دڵ، چارەسەر بکرێت تا سەلامەتی ئاسایی و سروشتی خۆی پەیدا بکاتەوە.

بــوغز و ڕەق و کینــە و بــەخیلی بەرامبــەر بــەو نیعمەتانــەی پــەروەدگار بـە کەسـێ کـە بـەخیلی پـێبراوە (کەسـێك کـە چـاوی

ئیرەیی لەسەرە) ئەویش وەکو بوغز و بەخیلی کەسی نەخۆشە. کە میزاج و سەلیقەی سەبارەت بە ئاو و خۆراك گۆڕاوە و ئەگەر کەسێکیتر لەبەردەمیدا ئاو خۆراك بخوات ئەوا تووشی نیگەرانی دەبێت. بەخیلیش توانایی بینینی نیعمەتەکانی ئیلاهی نیە کە بە کەسێکی بەخشیوە. کەواتە خۆشەویستی و بوغزیش کاتێك کە زیاد لە سنووری خۆی تێپەڕی کرد. وەکو شەهوەت و دەعبایەکە کە لە سنووری دیاری کراو تێپەڕێت و کەڕولاڵ بوونی دڵ سەبارەت بە بینینی ڕاستیەکان و ناسینی ئەو شتانەی کە بۆ لاشە سوود و زیانی هەیە. هەروەك کوێرێك بە گەڕانەوەی بینایی خۆی زۆر دڵ خۆش دەبێت. دڵیش بۆ بێدار بوون و گەڕانەوەی بینین و بیستنی ڕاستیەکان بێ سنوور شاد و گەش دەبێت. لەبەر ئەوەی کرانەوەی چاوەکانی دەرەوە لەگەڵ کرانەوەی چاوەکانی دڵ شیاوی بەراورد نیە. بەراوردێك کە ئێمە پێشنیار کرد جگە لە شوبهاندنێك هیچتر نیە کە بە هۆی تێگەیشتنی باشتر بابەتەکەمان باسکرد. هەر وەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿**وننزل من القران ما هو شفاءٌ و رحمةٌ للمؤمنين ولا يزيد الظالمين إلا خساراً**﴾ (الإسراء: ٨٢) واتە: (ئێمە ئایەتەکانی قورئان دەنێرینە خوارەوە کە دەبنە هۆی چاکبونەوەی _ دڵەکان لە نەخۆشیە جۆراوجۆرەکان _ و ڕەحمەت بۆ باوەڕداران _ بە هۆی بوونی ئیمان و ڕێنماییە پڕ خێر و

بەرەکەتـەکانی خواوەیـە _ بـەڵام جگـە لـە زیـان هـیچ شـتێکیتر بـە ستەمکاران ناگات).

هەڵبەتە بۆ کەسێك مایەی شیفایە کە باوەڕی بە چارەسەرەکەی هـەبێت کـە بـە دڵنیایـەوە بـاوەڕداران باوەڕیـان پـێ‌ی هەیـە و درمانەکەی بە هەتوانی دەردەکانیان دەزانن. بەو شێوەیە کە لاشە بـە هـۆی تێکـچوونی هێـزی ئاسـایی، نەخۆشـی بێ‌توانـا دەبێـت. دڵیش بە بوونی نابوودی لە خۆشەویستی و بوغز و پەیڕەوی کە هـەوا و ئـارەزووی نەفـسی، نـەخۆش دەکـەوێت. هـەروەك خـوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ومن أفضل ممـن اتبـع هـواه بغـير هـدى من الله﴾ (القـصص: ٥٠) واتـە: (چ کەسـێك گـومڕا و سـەر لێ شـێواوترە لـەو کەسـەی کـە لـە هـەوا و ئـارەزووی خـۆی پـەیڕەوی دەکـات، بـەبێ ئەوەی ڕێنمایەکی هەبێت لە لایەن خواوە).

﴿بل اتبع الذين ظلمو أهواءهم بغير علم﴾ (الروم: ٢٩) واتـە: (بـەڵکو سـتەمکاران بـەبێ زانـست و زانیـاری لـە هـەوا و ئـارەزووی خۆیـان پەیڕەوی دەکەن).

بەو شێوەیە کە ئەگـەر مـرۆڤ هـەر شـتێك کە لـە لاشـەی نـەخۆش دەبێت بەبێ گوێدان بە ووتەی پزیشك ئەنجام بدات ئەوا سـەلامەتی خـۆی لـە دەسـت دەدات. دڵـیش ئەگـەر بـەم شـێوەیە لـە هـەوا و ئارەزووی خۆی پەیڕەوی بکات ئـەوا لـە سـنوور دەرچـووە نـەخۆش دەکەوێت. هەروەها ئەگەر کەسی نەخۆش بە نەزانی هـەر شـتێك کە

ئیشتهای لێ بوو بخوات و لە هیچ شتێك پارێز نەکات و لە خواردنی دەرمانە تاڵەکان دوور بکەوێتەوە ئەوا تووشی زەرەر و زیانێکی زۆر دەبێت. بێ کەم و زیاد وەکو کەسێك کە لە بەرامبەر دەرمانە شیفا بەخشەکانی دڵدا بەم شێوەیە بێت و بە تاوان و گوناه و تام و چێژەکانی دنیایی نابوود و هەر شتێك کە نەفسی داوای دەکات، ئامادەی هەبێت، بکەیت، ئەوا لە کۆتایدا تووشی زەرەر و زیانێکی قورس دەبێت و لە ڕۆژی دوایشدا جگە لە دۆزەخ و سزاکانی ئیلاهی هیچ نسیبێکی نیە.

تەقوا: واتە دوور کەوتنەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە زیانیان هەبێت و ئەنجامدانی هەر کردەوەیەکی چاکە و سوود بەخش. کەواتە تەقوا یەعنی کار و کردار بە هەر شتێك کە دەبێتە مایەی سوود و قازانج و سەلامەتی. و دوور کەوتنەوە لە هەموو شتەکان کە بە ڕووکەشی بیس و زیان بەخشە. و مانی تەقوا لە ڕووی شەرعی یەوە لە بەرامبەر مانایی زەمانەوانی یەوە. تەقوا لە ڕووی شەرعی یەوە یەعنی ئەنجادانی واجب کراوەکان، خۆش ویستن و تەرك کردنی ناڕەوا و خراپیەکان هەر وەك تەقوای ئیلاهی لە قورئاندا بە ناوی یەکێك لە باسە بنەڕەتیەکانی ئیمانەوە باسکراوە.

و خوا لە باڕەوڕداران دەخوازێت کە ڕەچاوی تەقوا بکەن و لە حاڵەتێکدا بمرن کە تەقوایان هەبێت. خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿یاایها الذین امنوا ایقوا الله حق تقاته ولا تموتن الا وانتم مسلمون﴾

(ال عمران: ١٠٢) واتـە: (ئـەی کەسـانێك کـە ئیمانتـان هێنـاوە بـەو شێوەیە کە شایستەی زاتی خوایە لێی بترسن _ بە ئەنجامدانی واجب کراوەکان و دوور کەوتنەوە لە نەهی کراوەکان کانزای تەقوا بگرنە باوەش _ و نەمرن مەگەر ئەوەی کە موسڵمان بن یەعنی بە موسڵمانی بمرن).

نیشانەکانی تەقوا ئەمانەن: مرۆڤ خۆی بە خوا بسپێرێت واتە ئەوەی کە خوا فەرمانی داوە جێبەجێ بکات و ئەوەی کە نەهی لێ کـردووە ئـەنجام نـەدات. و جیاکردنـەوە و ناسـینی خێروشـەڕ بابەتـەکان بـەجێبهێڵێت بـۆ خـوای گـەورە. هـەروەك خـوا دەفەرمووێت: ﴿کتب علیکم القتال و هو کره لکم عسی أن تکرهوا شیئا وهو لکم وعسی أن تحبوا شیئا وهو شرٌ لکم﴾ (البقرة: ٢١٦) واتە: (جیهـاد لەسـەر ئێـوە واجـب کـراوە و ئـەوە بـۆ ئێـوە قـورس و ناڕەحەت، بەڵام و چ جای ئەوەی کە شتێکتان خۆش ناوێت و ئەو شتە بۆ ئێوە چاك بێت. و چ جای ئەوەی کە شتێکتان خۆش بوێت و ئەو شتە بۆ ئێوە خراپ بێت). ﴿و أمامن خاف مقام ربه و نهی النفس عن الهوان * فأن الجنة هی الحاوی﴾ (النازعات: ٤١) واتە: (وبەڵام ئەو کەسەی کە لە پلەوپایەی پەروەردگاری خۆی بترسێت و نەفسی لە هەوا و ئارەزوو بپارێزێت ئەوا بە دڵنیاییەوە بەهەشت جێگای ئەو کەسەیە).

**﴿و تودون أن غير ذات الشوكة تكون لكم﴾** (الأنفال: ٧) واتە: (ئێوە حەز دەکەن کە تاقمێك لە جیهاددا نەسیبی ئێوە ببێت کە توانا و هێز و قوەتێکی وای نیە).

ڕەچاو نەکردنی تەقوای ئیلاهی لە دنیادا دوا ڕۆژدا تووشی زەرەرو زیان دەبێت. شایانی وە بیرهێنانەوەیە کە مرۆڤ دەبێت خۆی لەو شتانەی کە دەبنە هۆی نەخۆشی لاشە بپارێزێت. و ئەگەر تووشی نەخۆشی بوو ئەوا دەبێ هەوڵ بدات تا خۆی چارەسەر بکات. و لە بارەی دڵیشەوە هەر بەم شێوەیەیە کە دەبێ لە ساغ و سەلامەتی دڵ پارێزگاری بکرێت و لە حاڵەتی تووش بوون بە نەخۆشی ئەوا بە فیکری چارەسەری ئەوەوە بێت تا زیاتر نەبێت.

بەهێز کردنی زانست و باوەڕ بە خوا و بیرکردنەوە لە بوون و بوونەوەر و ئەنجامدانی بەندایەتی شەرعی لە هۆکاری گرنگی پاراستنی دڵن و نەزانی و لاوازی ئیمان و سیستی نواندن لە ئەنجامدانی بەندایەتی یەکاندا بە هۆی گوێ نەدان بە دڵ دەژمێردرێت. هەر نەخۆشێك دەبێت بە دەرمانی تایبەتی خۆی چارەسەر بکرێت. وەك، داپۆشینی شتێك دەبێ بە بەڵگەی ڕۆشن، و خۆشەویستن ڕەوا لەگەڵ خۆشەویستن حەق چارەسەرکرد. هەر لەبەر ئەمەیە کە یەحیا بن عەمار دەیووت: (زانست پێنج جۆرە: زانستێك کە دەبێتە مایەیی ژیان و زیندو بوونی دین (ئایین) کە

هەر ئەو زانستەی یەکتاپەرستی و بیروباوەڕە ڕاستی یە. و زانستێك کە خۆراکی ئایینە. هەر ئەو فکر و عەقڵ و هزرەیە لە مانای قورئان و فەرموودەدا. زانستێك کە دەرمانی ئایینە، کە زانست فەتوا و شەرعیعەتە. زانستێك کە بەڵا و موسیبەتی ئایینە، و هەر ئەو زیاد کراوانەی دینە (بیدعەت) کە دروست کراون. زانستێك کە لە ناو بەردی ئایینە، و ئەو زانستانەی سحر و جادووگەری و فاڵچیە.

دڵ لەسەر فیترەتێکی پاك و ڕاست دروست کراوە و لە هەر مرۆڤێك، فیترەتی ئیلاهی بە ئامانەت دانراوە تا مرۆڤ بە بەکار هێنانی ئەو فیترەت و هێزە دەروونی یە خۆی لە حاڵەتێك لە وانە بە حاڵەتی بەهێز بگەڕێتەوە، بەڵام بە هۆی کاریگەری بیری ناڕەوا و ناڕاستی دەوروبەری فیترەت تووشی لە ناو چوون و گومڕایی دەبێت کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بە گرنگترین هۆکاری دەوروبەری لە فەرموودە پیرۆزەکەیدا ئاماژەیی بۆ دەکات و دەفەرمووێت: ((کل مولود یولد علی الفطرة فابواه یهودانه او ینظرانه او یمجسانه کما تنتج البهیمة بهیمة جمعاء هل تحسون فیها من جدعاء)) واتە: ((هەموو لە دایك بوویەك لەسەر فیترەتی خواناسی لە دایك دەبێت. بەڵام، دایك و باوکی ئەو دەکەن بە جوولەکە، مسیحی و یان مەجووسی. بەو شێوە کە بێچووی ئاژەڵ بە شێوەیەکی ساغ و

سه‌لامه‌ت له‌ دایك ده‌بێت. به‌ڵام دوایی بێچووه‌كه‌ی تووشی كه‌م ئه‌ندامی ده‌بێت)).

خوا له‌م باره‌یه‌وه‌ ده‌فه‌رمووێت: ﴿ومن فى السماوات و الارض كل له قانتون * وهو الذى يبداء الخلق ثم يعيده وهو أهون عليه وله المثل الأعلى فى السماوات والأرض﴾ (الروم: ٢٦-٢٧) واته‌: (هه‌رچی و هه‌ر شتێك كه‌ له‌ ئاسمان و زه‌ویدایه‌ هی خوای گه‌وره‌یه‌. و هه‌موویان فه‌رمان له‌وه‌وه‌ وه‌رده‌گرن و فه‌رمانبه‌ری ئه‌ون، ئه‌وه‌ كه‌ دروستكردنی ده‌ست پێكردووه‌ و پاشان ئه‌و ده‌گه‌ڕێنێته‌وه‌ و ئه‌مه‌ بۆ ئه‌و ئاسانه‌ _ چونكه‌ كه‌سێك كه‌ بتوانێت كارێك له‌سه‌ره‌تاوه‌ ده‌ست پێبكات ئه‌وا بێگومان هێزیشی بۆ دوباره‌ گه‌ڕاندنه‌وه‌ی هه‌یه‌ _ بڵندترین و گه‌وره‌ترین وه‌سف له‌ ئاسمان و زه‌ویدا هی خوای گه‌وره‌یه‌).

﴿بل ايبع الذين ظلموا اهواءهم بغير علم فمن يهدى من اضل الله ومالهم من ناصرين * فأقم وجهك للدين حنيفا فطرة الله ولكن أكثر الناس لا يعلمون﴾ (الروم: ٢٩-٣٠) واته‌: (موشریكانی سته‌مكار بۆ شیریك وتنی خۆیان به‌ڵگه‌یه‌كیان نیه‌، به‌ڵكو سته‌مكاران له‌ هه‌وا و هه‌وه‌سی خۆیان په‌یڕه‌وی ده‌كه‌ن به‌بێ زانست و زانیاری، چ كه‌سێك ده‌توانێت كه‌سێك كه‌ خوا ئه‌وی گومڕا كردووه‌ هیدایه‌ت بدات؟ هه‌رگیز بۆ ئه‌مانه‌ یارو یاوه‌ڕێك و هاودڵێك نیه‌. ڕووی خۆت به‌ پاك و بێگه‌ردی بكه‌ره‌ ئایینی ئیسلام، ئه‌مه‌ سرۆشتێكه‌ كه‌ خوا

خەڵکانی لەسەر دروست کردووە. نابێت سروشتی خوا بگۆڕدرێت و ئەو لەخۆ دا پەرستنی بە شریك قەراردان، لە دینداری بۆ بێدینی غار بدرێت. ئەمەیە ئایین بەهێز و وەستاو، بەڵام زۆرینەی خەڵکی نازانن).

لەم ئایەتەدا خوا ئەو خاڵەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و پێشانمان دەدات کە بەندەکانی لەسەر فیترەتی خواناسی و یەکتاپەرستی پاك و بێگەرد دروست کردووە. و ئەمە هەر ئەو جووڵانە ئاساییەی و فیترەتەی دڵە کە لە ڕاستیدا لە دروستکردنیدا تاو بدرێت لە ڕێڕەوی کماڵدا خۆی دەبینێتەوە. وەلێ ئەگەر بە پێچەوانەی فیترەتەوە بجوڵێت ئەوا بە پێچەوانەیماڵەوە دەبێت و تووشی هیلاکی و نابوودی دەبێت. بێگومان فیترەتی سالم بۆ بەردەوامی ژیانی پێویستی بە بەهێزی بە ئاو و خۆراکە، کە ئەو شتە جگە لە زانست و کردار و باوەڕ نی یە. بەو شێوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکدا کە ابن مەسعود (خوای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: ((ان کل ادب یحب ان تۆتی مأدبتە و ان مادبە الله هی القران)) واتە: ((هەموو میواندارێك حەز دەکات کە میوانداریەکەی بخورێت. و خۆراکی میوانی خوا، قورئانە)).

خوا قورئانی لە ئاسمانەوە بۆ شیفای دڵی باوەڕداران و هۆکارێك بۆ گەیشتن بە حەق ناردە خوارەوە. بێگومان لەم نێوانەدا

هەوڵەکان بە هۆی هەندی لە مرۆڤە گەورەکانەوە دروست دەبێت تا پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوا پتەوتر بکەن کە ئارام گرتن و خۆڕاگرتن لەبەرامبەر ئەم جۆرە بەلاّ و موسیبەتانە وەکو ئارام گرتنە لە بەرامبەر گرفتاری لاشەیی، ئەجر و پاداشتێکی زۆری هەیە. هەر وەك پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمووێت: ((ما یصیب المؤمن من وصب و لانصب و لاهم و لاحزن و لا اذی- حتی الشوکة یشاکها- الا کفر الله بها ضطایاه)) ولتە: ((کەسی باوەڕدار تووشی هەر جۆرە غەم و پەژارە و ماندوو بوونێك ببێت تەنانەت خوران کە لە لاشەشدا دەمێنێتەوە دەبێتە هۆی کەفارەتی گوناهەکانی)).

و خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿من یعمل سوءا یجزبە﴾ (النساء: ١٢٣) واتە: (هەر کەسێك کارێکی خراپ ئەنجام بدات ئەوا لەبەرامبەر ئەوەوە سزای خۆی وەردەگرێت). ئەگەر کەسێك لەم دونیایەدا گوناهەکانی پاك نبێتەوە ئەوا ئەمە کە لە ڕۆژیی دوایدا گوناهەکانی پاك دەبنەوە کە پاکبوونەوەی گوناه لەو ڕۆژەدا بە سزایی خوایی گەورەیە.

کاتێك دەڵێن: خوایا! ڕەحم بە فلان بکەیت. خوا دەڵێت: هەر ئەوەی کە ئەومان نەخۆش خستووە، ڕەحمم پێکردووە ئەو هەر وەها پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێت: ((المرض حطة، عطر الخطایا عن صاحبه کما تحط الشجرة الیابسة و رقها)) واتە: ((نەخۆش دەبێتە

مایەی وەرین. هەروەك چۆن کە دار ووشك بوو گەڵاکانی دەوەرن، نەخۆشیش گوناهەکان دەوەرێنێ)). لە بارەی هەندێك لە نەخۆشی یەکانی لاشەوە هاتووە کە ئەگەر مرۆڤ بە هۆیانەی بمرێ، ئەوا شەهیدە. وەك: سك ئێشە، شێرپەنچە (سەرەتان)ی لایەکی سنگ، و هەروەها مردن بە هۆی نوقم بوون لە ئاودا، سووتان و ڕووخانی شتێك بەسەر مرۆڤدا. هەڵبەت ئەمانە لە ئەحکامی دنیا بە شەهیدی نـــاژمێردرێن وەلێ لـــە ڕۆژێـــی دوایـــدا بـــەوان پاداشـــتی شەهیددەدرێتەوە.

لە نەخۆشیەکانی دڵ و مەعنەوی ئەگەر کەسێك ئارام گرتنی کردە پیشە و بەو هۆیانەوە بمرێت ئەوا شەهیدە. وەك: ترسێك کە لە گۆڕەپانی شەڕدا لای مرۆڤ دروست دەبێت. دەبێ بزانرێت کە بەخیلی و ترس لە نەخۆشیەکانی دڵ دژمێردرێن کە ئەگەر دڵ خـۆی نـەگرێت لـە بەرامبەریانـدا ئـەوا تووشـی ڕەنـج و بـەڵا و موسیبەت دەبێت و ئەگەر گوێیان پێنەدات، ئارام دەگرێت.

لە کۆتایدا دەبێ ئامـاژە بکرێـت کـە دڵـی مرۆڤـی بـاوەڕدار، بەردەوام لە بەردەم هێرشەکانی شەیتان و ووسوەسەکانیدایە. و هەر زەمان ئیحتیمالی هەیە کە تووشی جۆرەها نەخۆشی ببێت. لەم ڕووەوە دەبێ بە توونـدی ئاگادار بین. و تـەنها ڕێگـای پاراستن و ئاگاداری دڵ زانستی قورئان و سوننەتە ڕاستەکانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) و بخرێتە بواری عەمەلی و پراکتیکی یەوە.